# پێڕست:

## پێشکەش:



ئەم پەڕتووکە پێشکەش بێت بە رۆحی پاکی منداڵانی ئەنفال کراو کیمیا بارانکراوی کوردستان، هەروەها بە ئێوەی خوێنەر و سەرجەم ئەوانەی هەوڵ ئەدەن ڕابردوو ئێستامان بە زانست و زانیاری بناسێننن بە جیهان.

## پێزانین:

سەرەتا سوپاس بۆ خوای گەورە کە توانیم ئەم پەڕتووکە تەواو بکەم. هەروەها هاوڕێ ئازێزەکانم :
ئەندازیار کاوەی گەلاڵی پوور بۆ هاوپۆلکردنی بابەتەکان.
ئەندازیار بڕوا عوسمان بۆ دستکاری زمانەوانی کتێب و ڕێنمایی.
ئەندازیار ئاراس نوری ئەحمەد بۆ پێشنیار بۆ چاپ و دوایین دەستکاری زمانەوانی تکنیکی.
ئەندازیار سەلاح ئەحمەد بۆ ڕەستەسازی و دوایین دەستکاری زمانەوانی .
هاوڕێ خۆشەویستەکانم لە ماڵپەڕەکانی کوردئایتیگرووپ[1]،چاوگ[2] و زکورد[3] کە یارمەتیان دام لە بواری ئایتیکوردی بنووسم و فێربم.

1-kurditgroup.org
2-chawg.org
3-zkurd.org

## ڕێنمایی سوود وەرگرتن لەم پەڕتووکە

خوێنەری خوشەویست :

ئەم پەرتووکە لە سەر ئەو بنە ما نووسراوە کە ئێوەی بەکارهێنەری سیستەمی کارگێڕنی ویندۆز، شارەزاییێکی باشتان لە سەر ویندۆزەکانی پێش ویندۆزی ٨ هەیە. لە هەموویان گرنگتر زانینی بەکارهێنانی ویندۆزی ٧ی مایکرۆسۆفتە، بە پێی ئەم بنەمایە فرە لە سەر وەردەکاریەکانی ویندۆز قسە نەکراوە، بۆ نموونە بەشی ڕێکخستن (control panel) هەر ئەو کارە دەکات کە لە ویندۆزەکانی تر بووە بەڵام شێوەی دەستپێکەیشتنی گۆڕراوە و بەشی تری بۆ زۆر کراوە، هەروەها تا ئەو جێگا ڕستەکانی سادەم وەرنەگێڕاوە بۆ ئەوە بەکارهێنەری ویندۆزی ٨ دەبێت بزانێت سەتلی زبڵ بە چی دەڵێن و چۆن دەتوانی بیبەیت بەڕێوە. بە هەرحاڵ بۆ ئەوە کە گرفتێک نەبێت لەم بارەوە پێشنیار دەکەم پەڕتووکی " فێربوونی ویندۆزی ٧ " بە پێنووسی بەرێز ئەندازیار تایەر عەلی ڕەسول لە وزارەتی ڕۆشەنبیری و لاوان بخوێننەوە! ئەم پەڕتووکە لە سەرەتای دامەزراندن تا ئەو گۆڕانکارییە گرنگانەی کە لە سەر سیستەمی کارپێکردنی نوێ مایکرۆسۆفت ئەنجام دراوە ئاشنات دەکات.

## پێشەکی :

ئەگەر دوایین جار لەگەڵ ویندۆزی ٩٥ کارتان کردبێت بەدڵنیاییی ئەتوانن بێ هیچ کێشەیەک لەگەڵ ویندۆزی ٧ کار بکەن. بەڵام ئایا ئەم ئاستە بۆ ویندۆزی ٨یش وایە؟ وەڵامامان نەخێرە! بەم هۆیە کە ویندۆزی ٨ گەورەترین گۆڕانکارییە لە سیستەمی کارپێکردنی مایکرۆسۆفت! ئەگەر لە بیرمان مابێت مێنۆی ستارت لە ویندۆزی ٩٥ ناسرا بەڵام لە وینیدۆزی ٨ ئەم مینۆیە لاچوو[1] و جێگای بە پەڕەی startداوە. یەکەم جار کە بە ویندۆزی ٨ کار بکەن کەمێک کارکردنی دژوارە و جێگای ئایکۆنەکان بەخێرایی نادۆزنەوە چونکە بە تەواوی شێوازی گرافیکی گۆردراوە.

بەڵام ئەم گۆڕانکاریانە لە سەر ویندۆزی ٨ چیە :

- Metro Interface(ڕووکاری مێترۆ) :ڕووکارێکی نوێی بنەرەتی دەستپێکردنی سەرەتای ویندۆزە.
- Faster Boot Times(خێرایی بۆ کاتی بووت) : بەراستی ویندۆزی ٨ خێراتر لە ویندۆزی ٧ بووت دەبێت بۆ ئەوە کەمتر کاتی ڕێکخەر بەخۆی ترخان دەکات.
- Less Memory Usage(کەم کەردنەوەی سوود وەرگرتنی لە بیرگە) بە بەراوەرد لە گەڵ ویندۆزی ٧ ،ویندۆز ٨ کەمتر بیرگە بە خۆیەوە تەرخان دەکات.
- Hyper-V is now part of Windows (ئامێری گریمانەیی بەشێکە لە ویندۆز): ئێوە ئەتوانن هەر نەرماواڵەیەک لە سەر ویندۆز دامەزرێنن.
- Windows Store(فرۆشگای ویندۆز) : بۆ زیاد کردنی نەرمەواڵە لەسەر ویندۆز لە فرۆشگای مایکرۆسۆفت.
- New Task Manager(بەڕێوەبەری ئەرکی نوێی ویندۆز): بەڕاستی ئەم بەشە گۆرانکاری زۆری لێکراوە.
- Sky drive(بۆشایی پاشکەوتی هەوریی مایکرۆسۆفت): پەیوەندی بە بۆشایی هەوری (clouds) لە ویندۆزی ٨ بۆ هاوبەشی و پاشکەوتی پەرگەکان.
- Windows Live Integration (لێکدانی بەشی ویندۆز): ئێوە بە سادەیی ئەتوانن پەرگەکان بخەنە نێو ئیمەیل یان لێخوڕێکی هەورەژمێرکاری، کە لە هەژمارەی خۆتان لە مایکرۆسۆفت دروست بووە هەر وا ئاگاداری نامەکانتان لەو هەژمارە بن.
- Search(گەڕان) : بەشی گەڕان لە ویندۆز ٨ بە خێرایی بۆ هەر وشە پێشنیار ئەدات .
- multiple monitors(چەند شاشە) :دەتوانن ویندۆز ٨ لە چەند مانیتۆر بە کاغەز دیواری وشریتی ئەرکی جیاواز ببینن...هتد

لەم وێنەی لای خوارەوە جۆرەکانی ویندۆز و کاتی دروستبوونیان نیشان دراوە بۆ بەبیرهێنانەوەتان.




[1] – لە وەشانی ١ر٨ی ویندۆز مێنۆی ستارتی ویندۆز، دیسان لە بەشی دێسکتۆپ دابین کراوە.




### پەڕەی start چییە:

گەورەترین گۆڕانکاری ویندۆزی ٨ هاتنی پەڕەی دەستپێکردن (Start Screen)ە. ئەم پەڕەیە لە سەرەتا ناوی رووکاری مێترۆ[٢] بوو بەڵام بە هۆی نارەزایی فرۆشگایەک لە وڵاتی ئەڵمانیا کە ناوی مێترۆ بوو، مایکرۆسۆفت بە ناچار گۆڕی بە "ویندۆزی ٨ " ئینجابوو بە "UI Modern"[٣]. ئەم ناوانە بەرچاو نەکران وە بە ناچاری دیسان مایکرۆسۆفت ناوی نوێی لێنا "Start Screen". کێشە لە ناوەکەی نییە هەر ناوێکی هەبێت ئێوە رووکاری ویندۆزی فۆن و ئێکس پۆکسی تێدا دەبینن. هەروەها ناوی shortcutsەکان گۆڕدرا بە Tile (کاشی)، کاشییەکانیش ئەتوانن بە شێوازی سەرهێڵ یان زیندوو ناوەرۆکیان یان وێنەی ناو کاشیەکە لە هەر کات بگۆردرێت. کاشیە زیندووەکان ئەتوانن نوێترین هەواڵەکانتان پێ بدەن بۆ نموونە ئەمرۆ چەند ئیمەیڵتان بۆ هاتووە! سەردێری هەواڵنێرەکانتان پێ نیشان بدەن هەروەها پەڕەی دەستپێکردن رێدەدات بە تەواوی لە ئامێری پەڕەکان سوود وەربگرن وە تەواوی شاشە بە بەرنامە ی کراوە دادەپۆشێنێت و پێویست بە داخستن لەلایەن بەکارهێنەر ناکات وە هەر کات پرۆگرامێکی تر بکەیەوە پرۆگرامی پێشتر خۆکارانە دادەخرێت تاکو سەرچاوە بۆ بەرنامەکانی تر پڕ نەبێتەوە. ئەگەر تاقەتی کار کردن بە پەڕەی ستارتمان نەبوو دەتوانین بڕۆینە نێو بەشێکی تری ویندۆز ٨ بەو واتایەی ڕوومێزە desktop کۆنەکەی وەشانی ویندۆزەکانی پێشتر کە کەمێ گۆڕانکاری بە سەر هاتووە. زۆرتری گۆڕانکاریەکان لە لایەن مایکرۆسۆفت سوود وەرگرتن لە ویندۆز لە ساوئامێرەکان (touch)، تاتەبژمێرەکان (tablets) وە ساوپەردە (touch screen) لە کۆمپیوترەکانی All-in-oneە. بەشێکی تر ئەوەیە کە ئێوە ئەتوانن لە سەر هێڵ پرۆگرامی تایبەت دابەزێنن لە فروشگای مایکرۆسۆفت.

---

٢ - Metro

٣ - User interface Modern

## پێداویستیەکانی ڕەقەکالا بۆ دامەزراندن :

کەمترین ڕەقەکالاَ بۆ دامەزراندن وکارپێکردنی سیستەمی کارپێکردنی ویندۆز ئەبێت بە تایبەتمەندی خشتەی خوارەوە بێت:

| | | |
|---|---|---|
| CPU | 1GHz | پاڵپشتی لە NX, PAE, وە SSE2 بکات |
| RAM | 1 GB | ٢ گیگا بایت بۆ وشانی ٦٤ بیتی |
| Hard Drive | 16 GB | ٢٠ گیگ بۆ وشانی ٦٤ بیتی |
| Graphics | GPU | پاڵپشتی لە دایرێکسی٩ بکات |
| optical drive | -------- | بۆ دامەزراندنی ویندۆز لە ڕێگای dvd |

تێبینی: گەر لە سەرتاتەبژمێر (tablets) دایبمەزرێنی پێداویستی تایبەت بە خۆی هەیە کە لەم لێرە دا باسی لێوە نەکراوە.

## جۆرەکانی وشانی ویندۆز :

لە ساڵی٢٠١٢ ویندۆزی ٨ لە چوار وشان بڵاو کرایەوە.

- ویندۆز ٨ و ویندۆز ٨ ی پێشکەوتوو(Pro) بۆ مەسرەفکەرەکان لە زۆر یەک لە وڵاتانی جیهان.
- ویندۆزی ٨ی (Enterprise) بۆ کارگە وکۆمپانیا گەورەکان.
- ویندۆزی ٨ی (RT) لە پێشدا دامەزراوە بۆ سەر تاتەبژمێرەکان بە لۆگۆی (ARM) و کۆمپیوتەری کەسیی لە لایەن OEMs .

**تێبینی:** تەواوی وەشانی ویندۆز لە دوو جۆری ٣٢ بیت و٦٤ بیت دروستکراوە. جۆری ٣٢ بیت کە بەناوی X86 ناسراوە. جۆری ٣٢ بیت لە ویندۆزی ٨ تا ٤ گیگ ڕام پاڵپشتیدەکات. جۆری ٦٤ بیت کە ناسراوە بەX64 لە ویندۆزی ٨ تا ١٢٨ گیگ پاڵپشتی دەکات وەخێرایی نەرمەواڵەکانیش کە بۆ ئەم جۆرە نووسراوە زیاترە، ئاسایشیشی زۆرترە بەڵام دەبێت وەگەرخەری (drive) ڕەقەکالاَ کە گونجاوە بۆ ئەم جۆرە، پەیدای بکەن.

بۆ زانیاری: لە هەر وەشانێکی ویندۆز دا، گورزەی پینەکردن (service pack)یێک-کە کورتکراوەی دوو وشەی(sp)ن- لە لایەن ئەندازیارانی مایکرۆسۆفت بۆ پڕکردنی کون وکەلێن وشوێنە لاوازەکانی ویندۆز لە ماڵپەڕی فەرمی دایدەنێن دروستدەکرێن. بەکارهێنەری ویندۆز ئەم گورزانە لە ڕێگای نوێکردنەوەی ویندۆز باردەکاتە سەر ویندۆزەکەی وئاسایشی ویندۆز بەرز رادەگرێت. بەو شێوەیە سیستەمی ویندۆز بەهێزتر دەبێت لە بەرانبەر کەلێنە دۆزراوەکان کە بە (bugs) ناسراون، هاوکات ڤایرۆسەکان وە نەرمەواڵە خراپەکان کە زەرەر دەگەیێنن بە ویندۆز بەختی تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەیان کەمتر دەبێتەوە.

## لە بارەی دامەزراندن

دامەزراندنی ویندۆزی ٨ لەسەر کۆمپیوتەر کـارێکی زۆر ئاسـانە، بەڕاسـتی مایکرۆسـۆفت لەم بارەوە زۆر بەهێز کاری کردووە تەنیا دەبێ چەند پرسیارێک وەڵام بدەنەوە ئینجا دامەزراندن تەواو دەبێت.
باشتر وایە لە سەرەتا ویندۆز ویندۆز دامەزرێنن و وێنـدۆزی ٧ بەرز نەکەنە سـەر وینـدۆزی ٨ چـونکە زۆر نەرمەواڵە کە لە ویندۆز ٧ کارتان پێی نییە لەسەر ویندۆزی ٨ هەر وا دەمێنێت. هەروەها باشتر وایـە کە نوێترین درایڤی ڕەقەکاڵاکان لە ماڵپەڕی فەرمی دابەزێنن و دایمەزرێنن. وە لە تەواوی پەرگەکانتان پاڵپشتی بگرن.

## دەستپێکردن بە دامەزراندن :

دی ڤی دی ویندۆزی ٨ بۆ دامەزراندن بخەنە نێو درایڤەکەتان و سیستەمەکەتان لە سەرەتا بووت بکەن. دڵنیا بە کە bios یان uefi[٤] کۆمپیوتر لەسەر دی ڤی دی دامەزرێت. ئێستا کۆمپیوتەر ڕیستارت بکەن تا پەیامێک بێت کە دەڵێت دوگمەیەک لێ بدەن بۆ دامەزراندن لە سەر سی دی یان دی ڤی دی...




ئێوە ئەتوانن لە ڕێگای پۆرتی خالی فلاشێکی ٤ گیگیش شێوازی بووت تەعیین بکەن تا ویندۆز لە ڕێگای فلاش دامەزرێت.
خاڵ:کاتێک ئێوە کلیلێک لێنەدەن ویندۆز دەگەرێت بۆ ڕەقەکالایێکی تر کە بـووتی لە سـەر بێـت بـۆ وێنە دەچێتە سەر هاردەکەت ئەگەر ویندۆزێکی تری لە سەر بێت .
پرسیار ئەگەر ئەو رستەیەی کەلە ناو وێنەکەدا دیارە ، کاتێک کلیلێکتان لە سەر هەردوگمەیەکـی سـەر تەختە کلیل کرد، بەڵام دەرئەنجام پەیامی هەڵەی نیشان دا ئەوکات چیبکەن ؟

- لە پەڕەی بایووس (BIOS) بووتەکانتان چاودێری بکەن.
- هۆشیار بن کە دی ڤی دیەکەتان بەباشی نووسرا بێت.
- دڵنیا بن کە رەقەکالای کۆمپیوترەکەتان کێشەی نیە. بۆ وێنە هاردەکەتان بناسێت.

٢_ پاش فشار دانی کلیلێک لە سەر تەختە کلیلەکەت، پەڕەی دامەزراندنی ویندۆزی ٨ روون دەبێت.
خاڵ: لەم کاتە کە ئایکۆنی خرمەخرم( **loading**) دەست بە گەڕان دەکات، پەرگەکانی ویندۆز لە سەر بیرگە جێگیر دەبن. جێگای نیگەرانی نیە قۆناغەکانی دامەزراندن بەرداوام دەبێت.

---
٤ - Unified Extensible Firmware Interface



پاش جێگیر بوونی پەرگەکـان لەم قۆنـاغە زمانێـک بـۆ دامەزرانـدن هەروا شـوێنی کـات و پـارە و شێوازی پیتەکانی تەختەکلیلی ویندۆز هەڵدەبژێرن .دڵنیا بن کە زمانی دڵخوازی خۆتان هەڵبـژاردووە پاشان لە سەر دوگمەی Next کرتەیێک بکەن.




٣-لە پەڕەی نوێ کرتەیێک لە سەر دوکمەیinstall now لە ژێر لۆگۆی مایکرۆسۆفت بکەن .

⚠ کارتـان بە ڕەسـتەی Repair your computer(کۆمپیـوترەکەت تەعمیـر بکە)نەبێـت بـۆ ئەوەی کە ئێوە یەکەم جارە ویندۆز ٨ دادەمەزرێنن لە داهاتوودا لە سەر ئەم بابەتە ئەدوێین.




٤-پرۆسە یان قۆناغی دامەزراندنی ویندۆز ئێستا دەستی پێکرد.لێرە نابێت هیچ شتێک ئەنجام بدەن تەنیا چاوەڕوان بن.ئەم کردارەش چەند خولەکێک دەخایێنێت نابێت زۆر دوابکەوێت.




٣-لەم پەڕەیە کلیلی ٢٥ پیتی بەرهەمی مایکرۆسۆفت لە خشتەکە دەنووسن.کلیلی بەرهەم لەکاتێک دایە کە ویندۆزی مایکرۆسۆفت دەکڕن .هەرچەندە هێشتا ویندۆزی مایکرۆسۆفت نەهاتۆتە بازار هاککەرەکانی رووس وهیند ئەم بەشە لە چالاکی دەخەن.کاتێک ئێوە ویندۆز دابەزێنن کلیلی

بەرهەمتان بۆ ئیمەیل دەکرێت یان ئەگەر لە فروشگا ویندۆز بکڕن لە نێو پـاکەتی ویندۆزەکەتانـدایە.
بۆ چالاک کردنی وێندۆزەکەتان لە کام شێواز سوود وەردەگرن، ئەوە پەیوەندی بەخۆتانەوە هەیە .






٤-لەم پەرگەیەدا مایکرۆسـۆفت مەرجـی زۆری دانـاوە بـۆ سـوود وەرگـرتن لە بەرهەمە بەهێـزەکەی تەنانەت ئاگادارتان دەکات کە هەقتـان هەیە وینـدۆز لە سـەر سیسـتەمێک دامەزرێـنن و بە شـێوازی تۆمارکردنی کلیلی بەرهەم سوودی لێوەربگرن ئەم کردارەش تەنها تـایبەت بە وینـدۆز نـیە، لەزۆربەی ئەو نەرمەوالآنەی کە دەیکڕن بۆنمونە لە فۆتۆشۆپ و نەرمەواڵەکانی تر کە خۆرایی نین ئەم پەرگەیە هەمیشە دەبینن.پاش خوێندنەوەی و رازی بوون بە سوود وەرگرتن لەو بۆشایی یە لاکێشـەیی یە دا رەستەی "***I accept the license terms* box**" هەڵبژێرن و دوکمەی Next دابگرن.



٥-لەم پەڕگەی مایکرۆسۆفت دا پرسیارێکی زۆر گرنگتان لێدەکات، کە بریتیە لە ئایا کام لە جۆرەکانی دامەزراندنتان دەوێت؟ لێرەدا دوو هەڵبژاردنتان لەبەردەم دایە : دامەزراندن یان بەرزکردنەوە.ئێمە لە سەر بنەمای دامەزراندن دەچینە پێشەوە.




کرتەیێک لە سەر ڕەستەی (Custom: Install Windows only (advanced)تەنیا دامەزراندنی ویندۆز)بکەن.

ئەگەر ئێوە خەریکی بەرزکردنەوەی وشانی کۆنەی ویندۆز بۆ سەر ویندۆزی هەشتن پێشنیار ناکەم کە بەرزی بکەنەوە.بە هۆی ئەوە زۆر یەک لە نەرمەواڵەکانی وشانی کۆنەی ویندۆز لە سەر ویندۆز هەشتیش دەمێنێت کە لەوانەیە لە وشانێکی کۆنە و لە ویندۆز ٨ هیچ سوودێکی نابێت بۆتان.

٦-ویندۆزی ٨ بە شێوەی خۆکارانە هاردەکەتان دەناسێت ئەگەر ئەمانە کاری نەکرد . لەسەر دوگمەی load driver کرتەیەک بکە و دی ڤی دی یان فلۆپی درایڤەکە لە نێو سیستەم جێگیر بکەن ئەمکارە کاتێک ئەنجام بدەن کە مادێر بۆردەکەتان زۆر نوێیە و سیستەمی ویندۆزە نوێ یەکەتان ناناسێت یان لە RALD سوود وەردەگرن. ئەگەر پێتان خۆشە پارتیشێنێک بسڕنەوە لەسەر ڕستەی advanced کرتەیەک بکەن و دوگمەی delete هەڵبژێرن تا پارتیشن بەتەواوی بسڕێتەوە. هەروەها ئەتوانن پارتیشنەکانی تریش بەم جۆرە بسڕنەوە.گەر ویندۆز لەسەر هاردێکی نوێ دادەمەزرێنن چوارچێوەی unallocated space لێبدەن و دوگمەی next کرتە بکەن. ویندۆز بە شێوازی خۆکار پارتیشنی پێداویست دروستدەکات.هەر وەها ئەگەر پێتان خۆشە لە سەر پارتیشێنێکی تر بێجگە لە سیستەمی کارپێکردنی پێشوترتان دایمەزرێنن کێشەیێک نیە تەنها پارچەیێک (**partition**)- بە کەمتر لە قەبارەی ٢٥ گیگ نەبێت - هەڵبژێرن وکرتەیێک لە سەردوکمەی Nextبکەن.




٧-لەم قۆناخە ویندۆز لە سەر ئەو پارچە(پارتیشێنە)کە دەستنیشان دادەمەزرێت.ئێوە دەبێ تەنها چاوەڕوانی ئاکامی دامەزراندن بین.ئەم قۆناغە پەیوەندی بە خێرایی ڕەقەکاڵاکانی کۆمپیوترەکەت هەیە کە ١٠ تا ٢٠ خولەک دەخایێنێت.




٨ – پاش قۆناغی ژمارە ٧ کە پەرگەکانی ویندۆز کۆپی کران ، کۆمپیوتەرکەتان ریستارت دەبێت.ئەگەر گەرەکتان نیە چاوەڕوان بن دەتوانن کرتەیێک لە سەر دوگمەی **Restart now** بکەن.

⚠ پاش ئەوە کۆمپیوترەکەت داگرسا(Boot یان Restart )، پەیامی ژمارە ١ دەردەکەوێت بەڵام ئێوە نابێت کلیلێکی تر لێبدەن بۆ ئەوە پرۆسەی دامەزراندن لە سەرەتا دەستپێدەکاتەوە.




٩-ویندۆز پاش دەستپێکردنەوە یان ریستارت بەردەوام دەبێت لە دامەزراندنی زانیاریەکانی تایبەت بە نەرمەواڵەی ویندۆز.لێرەدا ویندۆز خۆی کاری خۆی ئەنجام ئەدات و ڕێگەی بە بەکارهێنەر نەداوە.



لەم قۆناغە لەوانەیە ئێوە کەمێک چاوەروان بن تا ویندۆز ئامرازەکانی تر ئامادە دەکات.
١٠-هەروەها کاتێک ئێوە چاوەڕوانی دامەزراندنی ویندۆز ٨ دەبن بە شێوازێکی زۆر باش، ژمارەی ئامادەبوونی ئامرازەکان دەبێت تا ١٠٠٪ پڕ بێتەوە، پشتی ئەم پەرگە ڕەشە ویندۆز خەریکی ئامادەکردن وناساندنی رقەکالاکانە بۆ کارکردنێکی باش لە سەر سیستەمەکەی ئێوە.




١١-لەم قۆناغە دامەزراندنی ویندۆز بە باشی تەواو دەبێت وە لەخوارەوەی پەرگە ڕەشەکە، ڕەستەیێک دەردەکەوێت کە بەشی ڕێکخستنەکان و تۆمارگەکانی ویندۆز دادەمەزرێت .




١٢-ویندۆز پەیامێکی تر ئەدات کە پێی خۆشە بۆجارێکی کە ریستارت بێتەوە هەڵبەت ئەم جارە پاش ناساندنی رەقەکالاکانی سیستەمەکەت وە ڕێکخستنیان لە گەڵ نەرمەواڵەی خودی ویندۆز .ئەمەش کاتێکی زۆر کەمە، کە تەنها چەند چرکەیەک دەخایەنێت !




پاش ڕیستارت (ژمارەی ١ دووپات دەبێتەوە تا ویندۆز لە سـەرەتاوە دەسـت بە دامەزرانـدن نەکـات دەتـوانی دی ڤـی دی وینـدۆز دەربێنیـت ) پەرگەی ژمـارە ٢دەردەکەوێـت کە خولەکێـک یـان دووان چاوەڕوانی دەوێت .

١٣-لەم قۆناغە کە بە پەڕەی wizard ی ویندۆز ناسراوە ویندۆز چوار بەستەرمان پێ نیشان ئەدات بـــۆ تەواو کردنـــی ڕێکخســـتنەکانی دامەزرانـــدن.ئەم چـــوار بە ســـتەرە بـــریتیە لە Personalize, Wireless, Settings, Sign in.ئەم پەڕە تەنها بۆ چەند چرکە دەردەکەوێت وە بە شێوازی خۆکارانە ویندۆز خۆی Personalize هەڵدەبژێرت




١٤-لە پەڕەی Personalize ئێمە دوو کار دەتوانین بکەین یەکەم ڕەنگێـک بـۆ کۆمپیوترەکەمـان هەڵبژێرین و دووەم ناوێک بۆ کۆمپیوترەکەمان بنووسین و دوکمەی Next دادەگرین.




رەنگـی کۆمپیوترەکەتـان زۆرتـر لە پەرەی سـتارت وە برێـک لە شـوێنەکان بەکـار دێـت وە بەسادەیی ئەتوانن بیگۆڕن.ناوی کۆمپیوترەکەتـان بـۆ ناسـاندن و رایلەکردنـی کۆمپیوترەکەتـان بە رایلەی کۆمپیوتەر بەکاردەهێنرێت.

١٥-ئێستا ویندۆز سیستەمی وایرلێسی ئێوە دەناسێت ئەڵبەت درایڤەکانی ناناسێت تەنیائێوە لە نێـو لیستەکە دەبێت ئامێری وایرلێسەکەی خۆتان نیشـانەبکەن و وشـەی نهێنـی بـۆ پەیوەنـدی بە تـۆری ئینترنێتی پێبدەن.لە پاشان دا کرتەیێک لە سەر دوکمەی Next بکەن.

١٦-لە پەڕەی رێکخستنەکانی بـنەڕەت ئێـوە پێویسـتە رێکخسـتنەکانی بنەرەتـی مایکرۆسـۆفت بـۆ ویندۆز پەسەند بکەن من کێشەیێک نابینم بۆ پەسەند کردن هەر چەندە دەتوانن ئەم رێکخستنانە بە پێی خوازی خۆتان بە کرتە لە سەر دوکمەی Customize ئەنجام بدەن بەڵام وا باشە هەر دوکمەی (سوود لە رێکخستنەکانی خێرا) Use express settingsکرتەیێک بکەن.



١٧-ئێستا ئێوە دوو ڕێگای جوانتان هەیە بۆ واژۆ کردنی ویندۆز:

ا- واژۆکردن لە ڕێگای هەژمارەی مایکرۆسۆفت:ئەگەر ئێوە هەژمارەی مایکرۆسۆفتان هەیە دەتوانن ئیمەیلەکەتان لێرە بنووسن یان ئیمەیلێک بە خوازی خۆتان بنووسن کە گوزارشی کارەکانی ویندۆز بدەن بە مایکرۆسۆفت.ئەم بەشە بە سوود وەرگرتن لە فروشگای ئەپەکان ونەرمەواڵەکانی مایکرۆسۆفتە کە لە ڕێگەی ئینتەرنێت لە سەر ویندۆزەکەت دایدەمەزرێنیت.

ب- واژۆکردن لە ڕێگای هەژمارە خۆمالی:ئەم ڕێگایە ،ڕێگاییێکی ستانداردی بۆ واژۆکردن بەتایبەت لە وەشانیەکانی پێشووی ویندۆز ( Windows7, Windows Vista, WindowsXP)مایکرۆسۆفتیش دابین کراوە.ئەم هەژمارەیە تەنیا بۆ بەشی ناوخۆیی ویندۆزە وە ناتوانن لە فرۆشگای ئەپەکانی مایکرۆسۆفت سوود وەربگرن.من پێشنیار دەکەم هەژمارەیێکی نوێ مایکرۆسۆفت بکەنەوە.




١٨-لەم قۆناخە هەژمارەی ناخۆیی ویندۆز دروستکرا.



١٩-ئەگەر ڕێکخستنەکانتان و تایبەتمەندیەکان کە لە سەر ویندۆز ئەنجام تان دا لەبیرتان مابێت وێندۆز خەریکە ئەم کارانەی ئێوە بۆ بەکارهێنەران ڕێک دەخات.کەمێک چاوەڕوان بن.




٢٠-ویندۆز ٨ دامەزرا تەنها چەند قۆناغی سادەوساکارمان پێش چاو کەوت.ویندۆز پەیامێکی گەورەمان لە ناوەندی پەڕە پێ نیشان ئەدات و ئەڵێت :"ئێمە لە حاڵی ئامادەکردنی کۆمپیوترەکەتین".لەخوارەوەی پەرگەکە ئاماژەدەکات کە تەنها چەند خولەک چاوەڕوان بە.




پیرۆز بێت ویندۆزت بە سەرکەوتوویی دامەزراند.

**تێبینییەک** کە لێرە بەرچاو دەکەوێت ئەوەیە کە دەبێت تەواوی ئەو درایڤانە کە بۆ ویندۆزی ٨ بڵاو بوەتەووە دامەزرێنن بۆ ئەم مەبەستەش یەکەم هەنگاو ئەوەیە کە درایڤەکانی ویندۆزی ٧ دامەزرێنن ئینجا بڕۆن بۆ لای درایڤەکانی دیکە.سەرەتا درایڤی تەختەی دایک دامەزرێنن ئینجا درایڤەکانی تر.زۆر جار دەبێت درایڤەکانی ویندۆز نوێ بکەنەوە.

٧-ویندۆز درایڤەکانی گرافیکی خۆی خۆکارانە دادەمەزرێنێت ئەم درایڤانە بۆ کارکردنی ویندۆز تەواون بەڵام کارکردێکی باشیان بۆ کایە (یاری) و کاری بەهێزی گرافیکیان نییە. بەم هۆیە دەبێ نوێترین وشانی درایڤی کارتی گرافیکی دامەزرێنن. ئینجا ئەگەر خێرایی ئەنتەرنێتان بەرزە ئەتوانن کارتەکان لە ڕێگای سەرهێڵ دامەزرێنن. لەسەر دێسکتۆپ کرتەی ڕاست بکەن و screen resolution هەڵبژێرن و ڕووناکی دێسکتۆپ بە جۆرێک ڕێک بخەن کە لەگەڵ جۆرایەتی شاشەکەتان ڕێک بکەوێت.




٨-شێوازی نوێکردنەوەی ویندۆزی ٨ تەنها ڕێگای داگرتن و دامەزراندنی خۆکاری نوێکارییەکانی ویندۆزتان پێ ئەدات بۆ ئەم گۆرانکاریانە تەنها دوگمەی X+ windows لێ بدەن و بچنە نێو control Panel پاشان لە خانەی گەڕان بنووسن windows update و لە سەر ڕستەی Change settingکرتەیەک بکەن و ڕستەی never check for update هەڵبژێرن تا ویندۆز لەکاتی نوێبوونەوە لە دۆخی چالاک دەرنەچێت. ڕێکخستنەکانی تریش ئەتوانن لەسەر ئەم بەشە ئەنجام بدەن. پاشان بڕۆنە پەڕەی ستارت windows update بنووسن لە سەری کرتەیێک بکەن دوگمەی install لێبدەن تا نوێترین پەرگەکانمان دامەزرێت.




٩- ویندۆزی ٨ بەشێکی هەیە کە ڕێتان پێ دەدات درایڤی گەڕاندنەوە دروست بکەن. بۆ ئەم مەبەستە تەنیا دوگمەی windows لێبدەن و بنووسن recovery. پاشان کرتەیەک لەسەر setting دەکەین و ڕستەی create a recovery drive هەڵدەبژێرین و next لێبدەن. فلاشێکی ٢٥٦ مێگابایتی یان بە قەبارەیەکی زۆرتر بدەن لە سیستەمەکەتان، ناوی درایڤی فلاشەکە هەڵبژێرن و دوگمەی Next لێبدەن. پەیامێک دەردەکەوێت کە پێت دەڵێ تەواوی پەرگەکانی نێو فلاشەکەتان دەسڕێنەوە ئینجا کرتەیەک لەسەر create بکەن ماوەیەک کات ئەخایەنێت. لە کۆتایی Finish لێبدەن و فلاشەکەتان هەڵگرن.لە داهاتوو قسە لە سەر ئەم بەشەش دەکەین.

## سوود وەرگرتن لە پەڕەی ستارت :

مێنۆی هەمیشەیی ستارت گۆڕدراوە بە پەڕەی ستارت کە تواناکانی زۆرتر بووە. وینـدۆزی ٨ دوو پەیوەندیدەری باشی بۆ بەکارهێنەر هەیە کە چاودێری کۆمپیوتەر بکات:

١ – دێسکتۆپ(بۆ بەکارهێنەری کۆمپیوتری شەخسی و لابتۆپ)

٢- کاشییە زیندووەکان.(فرەتر بۆ ئامێرە لەمسیەکان سوودی هەیە)

مایکرۆسۆفت ناوێکی دیکەی بۆ ئینتەرفەیسی ویندۆزی ٨ دانـاوە "start screen" ئەم پەڕەیە بـۆ دەستپێگەیشتن بە ئامێرەکان سوودی لێ وەردەگرن. زۆرێک لە بەرنامەکان دوو وەشانیان هەیە وەکو وێبگەڕی ئینتەرنێت ئێکسپلۆرەر یەکێکیان بۆ دێسکتۆپ و ئەوەی تریـان بـۆ پەڕەی سـتارت. بەڵام پەیوەندی بە بەکارهێنەر کە لە کامیان سوود وەردەگریـت بـۆ نمـوونە ئەگەر لە وەشـانی دێسـکتۆپ سوود وەربگرێت وەشانی وێبگەڕی دێسکتۆپ دێتە سەرەوە. بۆ ڕۆیشتن بـۆ پەڕەی سـتارت باشـتر وایە کە دوگمەی ویندۆز لەسەر تەختەکلیل لێ بدەن ئەگەر دووبارە ئەو دوگمەیە لێ بدەن دەچـنە نێـو بەرنامەیەک کە لە کۆتایی باسی لێوەکراوە. بەرنامەکانی پەڕەی ستارت دەتوانن کە توانایی زیاتریان هەبێت بە واتایەک هەرکات لەسەر هەر کامێکیان کرتەیەکـی ڕاسـت بـکەن ئەم تواناییـانە دەبینن.بـا بزانین ئەو کاشیانە چین وە قەبارەیان چۆنە هەر کاشیێک ئەم زانیاریانەمان پێدەدات :




:قەبارەی کاشیەکان : دەتوانین کاشیەکان بچوک بکەین وەکوو Mail وGames. دەتوانین کاشیەکان گەورە بکەین وەکوو کاشی Desktop، Skype وWeather...

هەروەها دەتوانن بە کرتەی چەپ کاشیەکان بگوێزینەوە(بیکێشن) بۆ هەر شوێنێک لە پەڕەی ستارت.

standard tiles: ئەمانە کاشی قەدپری(shortcut) پرۆگرامەکانی ئێوەن، لەسەر هەر کامێکیان کرتە بکەن ئینجا ئەتوانن بەو بەرنامە ئیش بکەن.

Live tiles: ئەم کاشیە زیندووانە نوێترین هەواڵ لەبارەی بەرنامەکانییان نیشان ئەدەن بۆ نموونە هەواڵی نوێی ئیمەیڵەکانتان نیشان ئەدەن.



به کرتەی ڕاست لەسەر کاشیە زیندوەکان (Live tiles)دوکمەکانی لای خوارەوە ڕوون دەبن:




| | |
|---|---|
| Smaller | ئەندازەی کاشییەکان بچوک دەکات. ئەگەر پێشتر بچکۆڵە بن لێرە وشەی larger نیشان ئەدرێت. |
| Turn off tile on | ئەم کارە دەبێتەی هۆی ئەوەی کە ئیتر کاشییە زیندووەکان لەسەرهێڵ نوێکاریان بەسەر نەیێت. ئەگەر ئەم ڕستەیە بکوژێننەوە ئەم ڕستەیە دەردەکەوێت Turn live tile on. |
| Unpin from start | ئەم ڕستەیە ئایکۆنەکان لەسەر پەڕەی live tile دەسرێتەوە |
| Uninstall | کاشیەکان دەسرێتەوە یان دەتانبات بۆ کۆنترۆڵ پانێل بۆ سرینەوە. |
| All apps | تەواوی ئەپلیکەیشێنەکان نیشان ئەدات |

بەکرتەی پەنجەی ڕاست لە سەر کاشیە ستانداردەکان(standard tiles) کرتەیەک دەکەین، دوکمەکانی خوارەوە دەردەکەون. بەڵام بە پێی هەر کاشیێک دوکمەکان کەمێ جیاوازن :

| | |
|---|---|
| :scrollbar minus button | ئەم دوگمەیە لەلای ڕاست لە خوارەوەی پەڕە دانراوە. ئەم شریتە بۆ ئەوە دانراوە کە بتوانن پەڕە دەستکاری بکەن. |
| :Pin to taskbar | ئەم ڕستەیە ئایکۆن بە شریتی ئەرکەکان دەچەسپێنێت .ئەوە لە کاتێک بەکار دێت کە هەم وەشانی دێسکتۆپ و وەشانی پەڕەی ستارتی هەبێت. |
| :Open new window | پەنجەرەیەکی نوێ لە بەرنامەکە دەکاتەوە. |
| :Run as administrator | بەرنامەکان لە دۆخی بەڕێوەبەری سیستەمەکە ئەنجام ئەدات تا دەستپێگەیشتنی تەواوی هەبێت. |
| :Open file location | پەنجەرەی وێبگەری ویندۆز دەکاتەوە کە ئەو پەرگەی هەڵبژێردراوە ویندۆزی تێدا جێگیر بکرێت. |



## گەڕان لە ویندۆز:

گەڕان لە ویندۆز زۆر ئاسانە وە ئێوە دەتوانن بە سادەیی و خێرایی بە هەر شتێک کە ئەتانەوێت پەیدای بکەنەوە. ئێوە ئەتوانن دوگمەی Windows دابگرن تا ڕووکاری نوێ ببینن و دەست بە نووسینی وشە بکەن یان دوگمەکانی Q+ Windows هاوکات لێی بدەن ئەڕۆنە پەڕەی گەڕان. ئەم تایبەتمەندییە خۆکارانە ئەنجامی گەڕانەکە دەردەخات. دەتوانن بە کرتە لەسەر setting یان file لە بابەتەکانی تر گەڕان ئەنجام بدەن. ڕوونکی بکەن کە گەڕان لە نێوان چی تر بێت تا ویندۆز بۆتانی پەیدا بکات.

Searchbar (شریتی گەڕان): ڕستەی گەڕان یان وشەکەتان لێرە بنووسن تەنانەت گەر پیتێکیش بنووسن ئەو وشە کە ئەو پیتەی تێدایە دەردەکەوێت.

Search: پێویستە لەسەر یەکێک لە ئامانجەکانی گەڕان کرتە بکەن تا پەڕگەکان لەنێو بەرنامەی تایبەتی خۆیان بکرێنەوە.




Open file (شوێنی دەرکەوتنی پەڕگە): لەسەر ئامانجی گەڕان کرتەی ڕاست بکەن یان لەسەر ئامێری لەمسی کرتەکە بەرەو سەرەوە هەڵبگرن تاکو پەڕگەکە لە وێبگەڕی ویندۆز دەرکەوێت.

Search service (خزمەتگوزاری گەڕان): شوێنی گەڕان بە کرتە لەسەر یەکێک لەم ئایکۆنانە بکەن.

File (فۆڵدەری پەڕگە): دەتوانن پەڕگەکان لەسەر بنەمای جۆرەکانی ڕیزبەندی بکەن هەروەکو ئەوەی کە وێنە بێت یان دەق....

## شێوازی ساید بای ساید :

هەرچەندە پرۆگرامەکانی پەڕەی ستارت بە تەواوی بۆشایی شاشە داگیردەکەن، بەڵام ئێمە دەتـوانین بە دوو بەرنامە بەیەکەوە ئیش بکەین وە لە شاشەکەمان بە تەواوی سوود وەر بگرین.بڕیـار دراوە ئامرازەکـانی پەڕەی سـتارت لە تەواوی پەڕەی بەنمـاییش دەربـێن کە ئەم کـارەش بـۆ ئەو ئـامێرانەیە کە شاشـەیەکی چکۆڵیان هەیە، زۆر باشە بە تایبەت تاتەبژمێرەکان و ئامرازە لەمسییەکان. بەڵام کاتی وا هەیە پێمان خۆشـە لە شاشەکەمان سوودێکی تەواو وەربگرین وە بـۆ ئەمە دۆخـی Side-by-side (لایەک بە لایەک) ڕێمان پێ دەدات پرۆگرام بە جۆرێک ڕێک بخەین کە سـێیەکی شاشـەکەمان بگرێـت و ئەوەش بمێنێـتەوە بـۆ هەر بەرنامەیەکی تر. ئەو ئـامرازە کە یەک لە سـێی شاشـەکە دەگرێـت تـا نەیبەیـنە سـەر جێگـای خـۆی هەر وا دەمێنێت. بـۆ ئەم کـارە دەبێـت ڕوونـاکی شاشـەکەمان ١٣٦٦*٧٦٨ بەرەو سـەر بێـت. لە وێـنەی خـوارەوە جێگاکانمان نیشانداوە:

**بەشی یەکەم:** بەرنامـەی پاڵدەسـتی نێـوی هەیە. ئەمە ئەو ئامرازەیە کە سێیەکی پەڕە دەگرێتە خۆی و لە لایەن پەڕە دەمێنێت.

**بەشی دووەم:** پرۆگرامێکی چکۆڵەیە کە لە ناوەڕاستی پەڕە نێوی هەیە. مشکەکە بەینە سەرەوەی پەڕە تا هێمای مشک وەکو دەستی لێ بێت تا پەنجەرەیەکی چکۆڵ بێتەوە یان ئەو ببەن بۆ کەناری پەڕەکە تا ویندۆز بێتە نێو دۆخی Side-by-side.ئەگەر بیکێشنە خوارەوە بەرنامە دادەخرێت




**بەشی سـێ** BACK BAR : شـریتی ڕەش ئـەم شریتە بیبەن بۆ بەشی ڕاست تا بەرنامەکە چکۆڵـە بێت بە بەرنامەی چوارچێوەی پەڕە.

**بەشی چوار** Charms (ئەفسوونەکان): هێمای مشـکەکە بـبەن بۆ سەرەوە یان خوارەوە لەلای ڕاست تـا بـیگەیەنن بـە پـەڕەی charms ئەو بەشـــە بـــۆ ڕێکخســـتنەکانی پـــەڕە ســـوودی لێـوەردەگرن نەک بەرنامـە چکۆڵـەکان.لـەم بـارە زۆرتـر قسـە دەکین.

## شێوازی دێسکتۆپ :

هەرچەند شێوازی دیسکتۆپ وەکو شێوازی دیسکتۆپی ویندۆزەکانی ترە بەڵام جیاوازی زۆری تێدایە کە بووە بە هۆکارێک بۆ باشتر کارکردنی ئەم جۆرە دێسکتۆپە

شێوازی دیسکتۆپ هەر ئەو شێوازەیە کە لە سیستەمی کارپێکردن چاوەڕوانی بووین و بەرنامە ئاساییەکانی ویندۆزی لێ جێگیر بوون و زۆر شێوەی لەگەڵ ویندۆزی ٧ نزیکە بەڵام مێنۆی ستارت نییە و دەبێ بڕۆین بۆ پەڕەی ستارت.

Dialog Coping: کۆپیکردنی پەڕگەگان زۆر شێوەی ویندۆزی ٧ دەدات تەنیا بەم جیاوازییە کە خێراتر بووە و دەتوانن لەکاتی کۆپیکردن بە دوگمەی Pause بی وەستێنن.




Explorer Windows: هەر ئەو شتەیە کە لە ویندۆزی ٧ هەیە شریتی گەڕان بۆ پەیداکردنی پەڕگەکان. هەروەها ئەمەش لە رووکاری ریبۆنی ئۆفیس سوود وەردەگرێت وە بۆ ئەم مەبەستە دەبێت لە سەر مێنۆی Home , Share View, کرتەیەک بکەن.



Charms: بــە بردنـــی نیشـــانگەری مشکەکە بەرەو سەرەوە یان خـوارەوە لـە لای راسـتی پـەڕەی شـریتی charms ئـاوەڵا دەبێـت و ڕێتـان پـێ دەدات کـە تەواوی ڕێکخستنەکانی ئەم بەشە ئەنجام بدەن.

Switcher App: ئـەم تایبەتمەنـدییە بـۆ جێگـۆڕکێ لـەنێو بەرنامەکانداییە کە لە تەواوی بەشەکانی ویندۆزی ٨دا هەیە. تەنیا نیشانەی مشکەکە ببەن بۆ کەناری چەپی پـەڕەکە تـا وێنـەیەکی نوێی ئەو بەرنامانە کە سـوودتان لـێ وەرگرتـووە ببیـنن. یـان نیشانەی مشکەکە ببەن بۆ بەشی خـوارەوە تـا تـەواوی بەرنامە کراوەکـانی کاشـییەکان ببیـنن. جێگـۆڕکێ لـەنێو بەرنامـەکانی دێسکتۆپ بەو ڕیزبەندییەیە کە هەمیشە alt+tab لێدەدەین.




Thumbnails: مشکەکە لەسەر ئایکۆنێک بوەسـتێنن و پاشبنەمایەکی وێنە چکۆڵەکەی بەرنامەکـە دەبیـنن. لـە بەرنامەی دەنگ و ڕەنگەکان دەتوانن بیان وەستێنن یان پەرگەیێکی تر هەڵبژێرنەوە.

Start: هێمـای مشـکەکە بـبە خـوارەوە کەناری چەپ تـا ئـایکۆنی سـتارت ببینـن. کاتێک کرتەمان لە سەری کرد دەچینە پەڕەی ستارت.

## سوودوەرگرتن لە ئەفسوونەکانی ویندۆز

Charmەکــان لە سەرتاســەری وینــدۆز دەبینــرێن و شــێوازێکە نــوێیە بــۆ ســوودوەرگرتن لە ڕێکخستنەکانی ویندۆز. ئەم شـریتە دەستپێگەیشـتنی زۆرتـان بە تایبەتمەنـدییەکانی وینـدۆز ئەدات لەهەر بەرنامەیەک جیاوازن وە زۆرێک لەوانە لە بەرنامەکانی تر بێ سـوودن. فێربـوونی کـارپێکردن لەم چارمانە زۆر ڕێک و پێکن بە هۆی ئەوەی خێراییتان زۆر باشتر دەکات لە شێوازە کۆنەکەی.

١ – لەلای ڕاستی پەڕەکەمان ئێوە ئەتوانن بەمجۆرە charmەکان چالاک بکەن:
هەر کاتێک گەرەکتان بوو مێنۆی مشـکەکە سـەرەتا لە سـەرەوە یـان لە خـوارەوە لەلای ڕاست بیبەن یـان هاوکـات دوگمەکانی windows+C لێبدەن. دوای هـاتنی مێنـۆ، ئەو ئـایکۆنە کە گەرەکتـانە هەڵـی بژێـرن. زۆرێـک لەمانە کارێکی تایبەت دەکەن وەکو SEARCH گەڕان لەنێو بەرنامەیەک یانSTART کە ئێوە ئەبات بۆ پەڕەی ستارت.



SHARE: بۆ هاوبەشیکردنی بەرنامەکان لەگەڵ کەسانی ترە هەڵبەت ئەم بەستەرانە پەیوەندی بەوجۆرە بەرنامە هەیە کە سـوودی لـێ وەردەگـرن و تەنیـا لە پەڕەی سـتارت دەستپێگەیشـتنی بـۆ هەیە. بـۆ نموونە بچـن بـۆ بەرنـامەی Photos(لێرە وێگەرێکم کردووەتەوە) وێنەیەک بکەنەوە. ئینجا charmەکان بهێنن پاشان بەشی Share و Mail لێ بدەن تا وێنەکە بە ئیمەیل بنێرن لەم کاتەدا ئامرازی مەیل بە شریتی کەنار دەکرێتەوە تا کاری ئێوە سادە بکـاتەوە دوگـمەی تـری هاوبەشـی لەگەڵ skydrive خزمەتگـوزاری هەوری مایکرۆسـۆفتە ڕێگـایەکی نـوێیە بـۆ هاوبەشـی زانیارییەکان.



٣-بەشی devices پەیوەندی بە بەرنامەکان هەیە کە کارتان پێ کردووە و ڕێگاتـان پـێ دەدات کە ئەو زانیـارییەی کەدەتانەوێـت بە ڕەقەکـاڵای پەیوەنـدیـدار بە کۆمپیـوتەر بینێـرن. بـۆ نمـوونە لە ژمـارەی ٢ لەphotos دەتـوانن بە charms ئینجا بڕۆنە نێو Devices تـا لیسـتێک لە چاپگەڕەکـانی پەیوەنـدیـدار بە کۆمپیوتەرەکەتـان بـۆ چـاپی وێنەکەتان ببینن.




٤ –Setting ڕێکخستنەکانی بەرنامە دەردەخات. بۆ نمـوونە لە بەشـی Mail ئەتـوانن لەم بەشـە هەژمـارێکی نـوێ دروست بکەن یان هەژماری پێشتری خۆتان بگۆڕن. هەروەها ئەتوانن ڕێکخستنەکانی دەنگ و ڕایەڵ و کوژاندنەوەی کۆمپیوتەرەکەتان بگۆڕن هەروەها بە کرتە لەسەر Change pc ئەتوانن شێوازی کاری کۆمپیوتەرەکەتان بگۆڕن.



## گۆڕینی ڕێکخستنەکانی ویندۆز

تەواوی ڕێکخستنەکانی ویندۆزی ٨ بە بەراورد لەگەڵ ویندۆزەکانی پێشووتر گۆڕدراوە، وە بۆ پەیداکردنی ئەم ڕێکخستنانە بەناچاری دەبێت بچن بۆ جێگاکانی دیکە.

ڕووکاری ویندۆز لەکاتی ویندۆزی ٩٥ زۆر گۆڕانکاری تێدا دیاری نەکراوە بۆ نموونە ئەگەر لە یادمان بێت لە ویندۆزی ٩٥ چۆن دەڕۆیشتین بۆ کۆنترۆڵ پانێل لە ویندۆزی ٧یش هەر وەها بوو بەڵام لە ویندۆزی ٨ شێوازەکە کەمێک گۆڕاوە وە ئەم سیستەمی کارپێکردنە شێوازی تری بۆ ئەم مەبەستە دابین کردووە ئێستا ئامرازی Pc Setting لە پەڕەی ستارت زۆر کاری ئاسان کردووە. هەڵبەت بۆ ئەوەی بزانن کە هەر ڕێکخستنێک و لە کوێ ئەنجام دەدرێت کارێکی زۆر گرنگە.




١-دەتوانن بە ئامرازی ئاسایی گەڕان بە شوێن settingی تایبەت بگەڕێن بۆ ئەم مەبەستە دوگمەی ویندۆز لە تەختەکلیل لێ بدەن و دەست بە نووسینی بکەن. هەروەها ئەتوانن بە لێدانی دوگمەی WINDOWS+W ڕاستەوخۆ بۆ گەڕان لە ڕێکخستنەکان بڕۆن و وشەی خۆتان بنووسن. لیستێک لە هەڵبژاردەکانتان بۆ دەردەکەوێت لەسەر هەر کامێکیان کرتە بکەن دەچنە نێو ئەو بەشە.




٢-ئەتوانن لە ئامرازی PC Setting سوود وەربگرن کە کارپێکردنی زۆر سادەیە وە تایبەتمەندیەکانی زۆری لە کۆنترۆڵ پانێل دەچێت. ڕووکارێکی ڕێک و پێک و جوانی هەیە. بۆ دەستپێگەیشتنی ئەم بەشە، لە شریتی charm لەسەر Setting(وێنەی١) کرتەیێک بکەن تا پەڕەی Setting ڕوون بێتەوە ئینجا لە سەر بەستەری change PC Setting(وێنەی٢) کرتەیەک بکەن (دواین بەش لە خوارەوەی پەڕەکە) ئەم ئامرازە ڕێکخستنەکانی لە چەند بەشێک جیاواز کردووە وە ڕێتان پێ دەدات ویندۆز بە هەر جۆرێک کە پێتان خۆشە دیاری بکەن، هەژمار بۆ بەکارهێنەر درووست بکەن، نوێکارییەکان دامەزرێنن و هۆشیارییەکانی (Notifications) ویندۆز بەڕێوە بەرن. زۆر کار پێیان ئاسانە زۆرینەی ڕێکخستنەکان دوو حاڵەتیان هەیە On یان Off لێرەدا

زۆری لە سەر نانووسم .بەڵام کێشە لێرەیە کە ڕێکخستنەکانی ویندۆزی بە تەواوی تێدا نییە وەکوو Control Panel .




٣-هەواڵێکی خۆش کە کۆنترۆڵ پانێل لە ویندۆزی ٨ هەروەک خۆی ماوە. دوگمەی ویندۆز لێبدەن وە بنووسن Control Panel. ئێستا لەسەر ئەو کرتەیەک بکەن تا کۆنترۆڵ پانێڵە کۆنەکەی ویندۆز ببینن. ڕووکاری تایبەت بەو category view،بەڵام لەسەر مێنۆی کرتەیەک بکەن و بیکەن بە large icons یان small icons بگۆڕێن. ئەو ئامرازانە کە ڕاهاتوون لە بەکارهێنانی دیاری بکەن ئەمەش وەک لە ویندۆزی ٧دا ڕێژراوە.






٤ – ویندۆزی ٧ ئامرازی زۆری هەبوو کە بەمجۆرە دەستپێگەیشتنیان بۆ دەکرا. لەسەر computer کرتەیەکی ڕاست دەکەن وە یەکێک لە بەستەرەکان هەڵدەبژێرن. بەڵام لە ویندۆز ٨ ئایکۆنی COMPUTER بە شێوەی پێش بنەڕەت ببینی کە ئەتوانن لە ڕێگای ڕێکخستنەکانی دیسکتۆپ ببینن. بەڵام ڕێگای ئاسان و ساکار ئەوەیە کە WINDOWS+X هاوکات لێبدەن. تا مێنۆی دیسکتۆپ بێتەوە بەم شێوازەش ڕێگەتان پێدەدات کە بەشە تایبەتییەکانی کۆنترۆڵ پانێڵ بە Task Manager. پەنجەرەی هێڵی فەرمان و بەشی Disk Management دەستپێگەیشتنمان بێت. سەیر ئەوەیە ئەم مێنۆیە لەهەر جێگایەکی ڕووکاری ویندۆزی ٨ کار دەکات و کێشەیەکتان لە پەیداکردنی ئامرازەکان نییە.وێنەی خوارەوە لە سەر پەڕەی ستارت WINDOWS+X لێدا.




وێنەی خوارەوە لە سەر پەڕەی دیسکتۆپ WINDOWS+X لێدا.



## کتێبخانەکان:

کتێبخانەکان لە ویندۆز کۆمەڵێک لە بۆخچەکانن کە پەیوەندیان بە یەکەوەیە. ئەم بوخچـانەش بەشێکی گرنگ لە وێندۆزی ٨ دروست دەکەن، لێرە دەستکاری و بەڕێوەبردنی ئەم کتێبخانانەتان فێر دەکەین.

وێندۆزی ٧ وشەی کتێبخانەکانی (Library)ناساند. هەر کتێبخـانەیەک لە چەنـد بـوخچەیەک پێـک هاتووە کە پەڕگەکانیان جیاواز لە جێگای پاشکەوت لەنێو هـارد، لە لای یەک هەڵـدەگرن بە واتـایەک کتێبخانەی Documents لە چەندین بوخچە لە بەشە جیاوازەکانی هارد دروست بـوون تـا ئەوەی کە کۆتایی بەم بوخچەیە بێت:

C:\Users>\username\<Documents

کتێبخانە ڕۆڵێکی گرنگی لە ویندۆزی ٨ هەیە لە ڕاستیدا بەشێکی گرنگ لە وێنـدۆزی ٨ بە یـارمەتی ئەمان کار دەکەن بۆ نموونە file history کە سیستەمی پشتگیری نوێی ویندۆزە لە ئێوەی گەرەکە کە لە libraryەکان بۆ پشتگیری ویندۆز سوود وەربگرن. هەر چەندە کـارکردن لەگەڵ کتێبخانەکـان ساکارە بەڵام دەبێت بە شێوازێکی دروست سوودی لێوەربگرین.

١-ویندۆزی ٨ چوار کتێبخانەی ناوخۆیی هەیە: Document، Music،Picture و Videosکە بـریتییە لە بـوخچە پێوانەییەکـان وەکـوو C:\Users\<username>\Doxuments .ئەم کتێبخانانە لە تەواوی پەنجەرەکانی وێبگەری ویندۆز بوونیان هەیە. بۆ نمـوونە لە پەنـجەرەی save لەلای چەپەوە کە لەژێـر نـاوی libraries دەتـوانی پەیـدایان بکەیـت. بـۆ دەستپێگەیشـتن بەم کتێبخانانە تەنیا کرتەیەک بکەن لەسەر ئەو شتە کە گەرەکتە.




خشتی گەڕان لە کتێبخانەی ویندۆز بۆ پەڕگەی تایبەت بۆ وێنە بۆ پەڕگەی دەنگ یان وێنەیێک بگەڕێن

بەشی نێو کتێبخانە کە بریتیە لە بوخچەکانی Document، Music،Picture و Videos ئێمە خۆمان بوخچەی Newfolderمان دروستکردوە

شێوازی نیشان دانی بۆخچە وپەڕگەکان لە هەر پەنجێرەیکی ویندۆز ٨

٢ – بۆ گۆڕانی ئەوەی کە هەر کتێبخانەیەک لە چ بوخچەیەک سوود وەربگرێت، پەنجەرەی وێبگەری ویندۆز بکەنەوە لەسەر ئەو کتێبخانەیە کە گەرەکتانە بیگۆڕن کرتەی ڕاست بکەن و بەشی properties هەڵبژێرن، پەنجەرەیەک دەکرێتەوە ، لەسەر ADD کرتەیەک بکەن و بوخچەیەک بە کتێبخانەکەتان زیاد بکەن.




هەروەها ئەتوانن ئەو بوخچانەش کە پێتان خۆشە بە بەشی کتێبخانە زیادی بکە. ئینجا include folder لێبدەن بەم شێوازە ویندۆز تێدەگەیەنیت کە دەبێت ئەو بوخچەیە ڕیزبەند بکات تاکو خێراتر دەست پێگەیشتنی ئاسان بێتەوە.




دوو دوکمەمان هەیە:

Add : بۆ زیاد کردنی بوخچە یان پەرگەیێک بە کتێبخانە

Remove : بۆ سرینەوەی پەرگە یان بوخچە لە کتێبخانەی تایبەت(ژمارەی ٣ بخوێنەرەوە)




٣-ئەتوانن بوخچەکان لە بەشی Library هەڵبژێرن و Remove لێبدەن تا بیسرنەوە ئەم تایبەتمەندییە کاتێک بەکار دەبرێت کە لە SSD بۆ بووتی هاردێکی ئاسایی سیستەمەکەتان سوود وەربگرن بەتایبەت گەرەکتان نەبێت بوخچەیەک لە شوێنی خۆکاری لە ssd ویندۆز دابنێن. هەروەها ئەتوانن بوخچەیەک لە

کتێبخانەکان هەڵبژێرن و set save location لێبدەن. کاتێک کارتان تەواو دەبێت دوگمەی OK لێبدەن. و قۆناغی٢ و ٣ بۆ کرداری گۆڕانکارییەکان لێبدەن.

٤-ئێوە بەسادەیی ئەتوانن کتێبخانەکانی خۆتان دروست بـکەن وە کتێبخـانە خۆکارەکـان ناتانخـاتە نێو سنوورێکی تایبەتداری ویندۆز. بـۆ ئەم کـارە لەسـەر Libraries لە پەنـجەرەی ویێگەڕەکەتـان کرتەیەکی ڕاسـت بـکەن و New وەlibrary لێبـدەن. نـاوی کتێبخانەکەتـان بنووسـن و Enter لێبدەن ئینجا لەسەر کتێبخانە دروستکراوەکەی خۆتان کرتەی ڕاست بکەن و properties هەڵبژێرن ئینجا لەسەر ADD کرتەیەک بکەن و هەر بوخچەیەکتان گەرەکە بیخەنە نێو کتێبخانەکەتان( شێوازی زیاد کردن پەڕگە یـان بـوخچە لە ژمارەی ٢ی ئەم بەشـە نیشـان دراوە) بـۆ نمـوونە ئەتـوانن ئەو کتێبخانەیە دابین بکەن کە چ پەڕگەیەکی تێدا بێت. هێمای ئایکۆنی پێش بنەڕەت بۆ دروست دەکرێت ئینجا دوگمەی OK لێبدەن.




بۆ نموونە من بوخچەی کوردئایتیگرووپم دروستکردوە کە بابەتەکانی ئەو ماڵپەڕەی لێدابنم

## سازدانی هەژمارەی بەکارهێنەران

بە ویندۆزی ٨ ئەتوانن هەژماری بەکارهێنەرانی ناوخۆیی و هەژمارەکانی مایکرۆسۆفت لە ئینتەرنێت بەڕێوەبەرن. دەمێکە ویندۆز لە بەشی فرە هەژماری و سوودوەرگرتن لە چەند هەژمارێکی بەکارهێنەر سیستەمێکی زۆر ڕێک و پێکە. لە ویندۆز ٨ جیاوازییەکی باش دەبینین کە بێجگە لە هەژماری بەکارهێنەرانی ناوخۆیی ئێوە ئەتوانن لە هەژماری بەکارهێنەری مایکرۆسۆفتیش سوود وەربگرن وەکو ئەو هەژمارەی کە یەکەم جار پاش دامەزراندنی ویندۆزی ٨ دروستان کردوە هەروەها وشەی نهێنی ڕایەڵە، گۆڕانکارییەکان بخەنە نێو هەژماری سەرهێڵی ئینتەرنێت و خۆتان لە هەر شوێنێک سوودی لێوەربگرن.

١ – بـڕۆنە نێـو Setting  PC و Users. گەر لە هەژمـاری مایکرۆسـۆفت سـوود وەردەگـرن ئێستاش ئەتـوانن ڕێکخسـتنەکانی ڕووکـاری ویندۆز و وێـنەی دێسـکتۆپەکەتان لە کۆمپیـوتەرێکی تریش ببێت. بەڵام تـا دڵنیـا نەبـن لەو کوومپیـوتەرە کەسـوودی لێـوەردەگەن وشـەی نهێنـی خۆتـان پاشکەوت ناکەن. بۆ ئەم کارەش دەبێت لە سەر ڕستەی Trust this Computer کرتەیەک بکەن تا ڕاستەوخۆ ئێوە بگەیەنێت بە هەژماری سەرهێڵتان وە کۆدی ئاسایشی مایکرۆسۆفتی لێ بنووسن




ئەگەر ئەم کۆدەتان نییە لەسەر بەستەری I didn't receive the code کرتە بکەن تـا شـێوازی ناردنی ئەم کۆدەتان بۆ دیاری بکرێت بۆ نـموونە دیـاری دەکەن بە چ ڕێگـایەک بۆتـان بێـت وەکـو کورتەنامە یان ئیمەیڵ.




کاتێـک کۆدەکەتـان لە نێـو خشـتەکە نووسـی کرتەلەسـەر دوکـمەیSubmait بـکەن تاپەیـامی پیرۆزباییتان پێ دەگات.




٢-بۆ گـۆڕینی وشـەی نهێنـی بەکـارهێنەر بـڕۆنە نێـو PC Setting و Users لەسـەر More account setting online کرتەیەک بکەن هەرکات بە هەژماری سەرهێڵی بەکـارهێنەری خۆتـان هاتنە ژوورەوە لەسەر بەستەری Change password کرتە بکەن و وشەی نهێنی خۆتان بگۆڕن، ئەم کارە دەبێت بە هۆکارێک کە وشەی نهێنی تەواوی کۆمپیوتەرەکانتان لە کۆمپیوتەرەکانی تـریش بگۆڕێت.




٣-بۆ زیادکردنی بەکارهێنەری نوێ بڕۆنە بەشی PC Setting و User لەسەر ڕستەی Add a user کـرتەیەک بـکەن ناونیشـانی ئیمەیڵـی هەژمـاری مایکرۆسـۆفت کە کەپێویسـتە بـۆ کۆمپیوتەرەکەتان بنووسن و لەسەر دوگمەی Next کرتەیەک بکەن.




پاشان لێتان دەپرسێت کە ئەم هەژمارە بۆ منداڵە یان بۆ گەوران؟ تا ئەگەر پێتان خۆشە بەشی Family Safety بۆ سنووردار کردنی دەستپێگەیشتنی منداڵان چالاک بکەن ئینجا لە کۆتایی finish لێبدەن. یەکەم جار کە بتەوێ هەژماری بەکارهێنەری خۆت پەیوەندی بەو کۆمپیوتەرە بگرێت، دەبێت پەیوەندی ئینتەرنێتت هەبێت.

٤-ئەتوانن وەکو جاران هەژمار درووست بکەن بەڵام ئەم هەژمارانە بە فرۆشگای مایکرۆسۆفت دەست پێگەیشتنیان نییە وە زانیارییەکانی لەنێو کۆمپیوتەرەکان ئاڵوگۆڕ نابێت، بەڵام سوودوەرگرتن لەوان بۆ هاوبەشی پەڕگەکان لە کۆمپیوتەرەکانی ناوخۆیی بەسوودە بۆ ئەم مەبستە بڕۆنە نێو PC Setting و Users پاشان کرتەیەک لەسەر Add a user بکەن (وێنەی ژمارە٣) . لەسەر ڕستەی Sign in without a microsoft account کرتەیەک بکەن.



و local account لێبدەن. ناوی بەکارهێنەر و وشەی نهێنی بنووسن و کرتەیەک لەسەر دوگمەی Next بکەن.(لێرە من بەکارهێنەرێک بە ناوی zkurdم دروست دەکەم)




ئەگەر پێتان خۆشە بەشی Family Safety بۆ سنووردار کردنی دەستپێگەیشتنی منداڵان چالاک بکەن ئینجا لە کۆتایی دا کرتەی لەسەر finish بکەن.




٥-لە پەڕەی Users ئامرازی PC setting، ناتوانن بەکارهێنەران بسڕنەوە یان جۆری هەژماری بەکارهێنەر بگۆڕن یان بیسڕنەوە. بۆ گۆرانکاری پەرەسەندوو دەبێت بە Control Panel و User Accounts بڕۆن لەوێ ئەتوانن لەسەر Manage another account کرتەیەک بکەن تا هەژماری بەکارهێنەرێکی تر بگۆڕن.



لەسەر Click the account type کرتەیەک بکەن تا هەژماری بەکارهێنەر بە شێوازی Administrator (بەڕێوەبەر)یان Standard (ئاسایی) دەربێنن. هەژماری Standard ناتوانێ نەرمەواڵە دامەزرێنێت یان ڕێکخستنەکانی نهێنی ویندۆز بگۆڕێت.




بۆ سڕینەوەی هەژماری بەکارهێنەران ئەتوانن لەسەر Delete the account کرتەیەک بکەن.




بەستەرەکانی تری ئەم پەڕەیە :

| | |
|---|---|
| گۆڕانی ناوی هەژمارەی بەکارهێنەر | Change the account name |
| گۆڕانی وشەی نهێنی بەکارهێنەر | Change the password |
| بۆ سنوردار کردنی دەستپێگەیشتنی منداڵان | Set up Family safety |

## سازکردنی دێسکتۆپ

بەتەواوی سازدانی ویندۆزی ٨ زۆر لە دێسکتۆپی ویندۆزی ٧ دەچێت. هەرچەند جیاوازی زۆری تێدایە بۆ نموونە ئەتوانن ئەوانە بەو شێوەیەی خوازیارن دەربخەن.

١ -لەسەر شریتی ئەرکەکان (taskbar) کرتەیەکی ڕاست بکەن و properties هەڵبژێرن




لە پەنجەرەیەک کە بە نمایش دێت دەتوانن شریتی کردارەکان بگۆڕن بەتایبەت تایبەتمەندییەکانی auto-hide ڕێک بخەن. هەرچەند لقێک لەم بەشەدا هەیە کە ئەتوانن لە چەند دێسکتۆپێک سوود وەربگرن تەنانەت ئەتوانن شریتی کردارەکان لە هەر شاشەیەک کە پێتان خۆشە دەربکەوێت یان تەنیا لە کۆمپیوتەری ڕەسەن (بنەڕەتی) شریتی ئەرک دەربکەوێت. بەڵام بەستەری بنەڕەتی بە شێوازی خۆکار تەواوی ئایکۆنەکان(وێنۆچکەکان) لە شاشەکان بۆ دەرکەوتن هەڵبژاردراوە، بەڵام باشتر وایە ڕستەی taskbar where windows is open لە مێنۆی Show taskbar button on هەڵبژێرن تا ئایکۆنەکان تەنیا لە جێگایەک دەرکەون کە پەنجەرەی تایبەت بەوان دەکرێتەوە. ئەگەر شاشەکە لەم دۆخە شریتی ئەرکی تایبەت بە خۆی هەیە ئایکۆنە چالاکەکان دەردەکەون.




٢ –شێوازی نیشاندانی بەرنامەکان لە بەشی ڕاگەیاندنەکان (Area Notification).




بە کرتە لەسەر Customize لە پەنجەرەی Taskbar Properties ، پەنجەرەیەک دەکرێتەوە لیستێک لە پرۆگرامەکانتان بۆ نیشان ئەدات کە ئەتوانن ئەمانە لەنێو ئەو لیستە دیاری بکەن: چ ڕاگەیاندن و ئایکۆنی پرۆگرامێک لەو بەشە دەرکەوێت؟ ئایا تەنیا ڕاگەیاندنەکان دەربکەوێت؟ یان ئایکۆنەکان؟ یان هەردووکیان بشاردرێنەوە؟




٣-لە دێسکتۆپ زۆرێک لە ئایکۆنەکان وەکو Network ،Control Panel ،Computer دانەنراون .بەڵام گەڕانەوەیان کارێکی زۆر سادەیە.لەسەر **دێسکتۆپ** کرتەیەکی ڕاست بکەن وە personalize هەڵبژێرن.







ئینجا ڕستەی Change Desktop icons لێبدەن چوارچێوەی ئەو ئایکۆنانە کە پێتان خۆشە لە دێسکتۆپ ببینن هەڵبژێرن.

: هەرکات ڕستەی Allow themes to change Desktop icons دەستنیشان نەکەن، کاتێک کە ڕووکاری ویندۆز بگۆڕن ئەم ئایکۆنانە دەشاردرێنەوە یان شێوەیان دەگۆڕدرێتەکۆتایی OK لێبدەن تا ئەوئایکۆنانە ببینن کە زیادتان کردووە بۆ دێسکتۆپ.

## گۆڕینی ڕووکاری دێسکتۆپ

وینـدۆز ٨ وە دێسـکتۆپەکەی دەتوانرێـت بە هەر شـێوازێک کە پێتـان خۆشـە ڕووکـارەکەی بگـۆڕن. تەنـانەت کـاغەزی دیوارەکەتـان دەسـتکاری بـکەن، تەنیـا جێیـەک نـابینین ئەوەیە کە لە وێندۆزی ٧ ڕێکخستنی ڕووناکی ڕووکاری Aero هەبوو، لێرە ئەو ڕووکارە نییە.

١ – لەسەر دێسکتۆپ کرتەی ڕاست بکەن و وشەی Personalize لێبدەن.

٢ – لەسەر Desktop Background لە خوارەوەی پەڕەکە کرتەیەک بکەن تا وێـنەی پاشـبنەما هەڵبژێرن،




دەتوانن لە مێنـۆکە شـێوازی Picture Location جێگـای وێـنە هەڵبژێـرن، یـان بەسـەر مێنـۆی browse بڕۆن و لە هاردەکەتان وێنەیەک پەیدا بکەن و بیکەنە پاشبنەمای کۆمپیوتەرەکەتان.



ئەگەر چەند وێنەیەک هەڵبژێرن وێنەکان بە شێوازی خۆکارانە دەگۆڕێن وە هەر جارێک بە شێوازی خۆکارانە وێنەیەکی هەڵبژێردراو نیشان ئەدات، ئێوە دەتوانن لە بەشی Change picture every دابینی بکەن کە وێنەکان لە چ کاتێک بگۆڕدرێن.( من چەند وێنەیەکی نێو هاردەکەم هەڵبژاردوە هەرهەموویانم نیشانەکردوە کە هەر ۳۰ خولەک وێنەیەک لە سەر شاشەکەم نیشان بدرێت)






۳- پاڵپشتی بۆ چەند شاشە لە ویندۆزی ۸ زۆر باشتر بووە، گەر وێنەیەکی پانۆراما یان بە جۆرایەتییەکی بەرزتان هەیە ئەتوانن لە سەرتاسەری شاشەکە نیشانی بدەن لەبەر ئەم هۆیە لەسەر بەشی Picture positionکرتەیەک بکەن و Span هەڵبژێرن.

٤-هەر وا ئەتوانن دابینی بکەن کە لەسەر شاشە وێنەی تایبەت بە خۆی جێگیر بێت. سەرەتا Clear all لێبدەن تا وێنەکە لە دۆخی هەڵبژێردراو دەربێت، ئینجا لەسەر هەر وێنەیەک کە گەرەکتانە نیشان بدرێت کرتەیەکی ڕاست بکەن و لە مێنۆ هەڵبژێرن کە وێنەکە لەسەر کام شاشە نیشان بدرێت، ئەم کارە بۆ شاشەکانی جیاواز دووپات بکەنەوە، هەڵبەت لەم کاتە دا بەشی span ناچالاک دەبێت.

٥-لەسەر Color لە خوارەوەی پەنجەرەی Personalization کرتەیەک بکەن.




ئەم کارە ڕێتان پێدەدات کە ڕەنگی شریتی ئەرک و شریتی سەردێڕ بگۆڕن، دەتوانن خۆتان ڕەنگێک هەڵبژێرن و فرەیی ڕەنگەکە ڕێک بخەن یان بە شێوازی خۆکارانە ئەم بەشە هەڵبژێرن، بەم شێوازە ڕەنگەکە لە وێنەی پاشبنەما دابین دەکرێت. ئینجا Save Change لێبدەن.




٦-ئەگەر ڕێکخستنەکانتان ئەنجام دابێت ڕووکاری خۆتانتان دروست کردووە بەڵام هێشتا پاشکەوتتان نەکردووە، لەسەری کرتەیەکی ڕاست بکەن و Save theme هەڵبژێرن، ناوێکی بۆ دیاری بکەن، کاتێک لە هەژماری مایکرۆسۆفت سوود وەردەگرن ئەم ڕووکارە لەسەر تەواوی کۆمپیوتەرەکانی خۆتان دەبینن، هەروەها دەتوان ڕستەی Save theme for sharing لێبدەن تا ڕێکخستنەکانتان لەنێو پەڕگەیەک پاشکەوت بکرێت وە لەگەڵ هاوڕێکانتان هاوبەشی بکەن، هاوڕێکانیشتان دەتوانن لەسەر ڕووکارەکەتان دوو جار کرتە بکەن تا ڕووکارەکەی ئێوە لەسەر کۆمپیوتەرەکەیان ببینن.

## سازکردنی پەڕەی ستارت

سازدانی پەڕەی ستارت بەتەواوی جیاوازە لە سازدانی دێسکتۆپ، لەم بەشە بە ڕێکخستنەکانی ئەم پەڕەیە ئاشنا دەبین.

١-بڕۆنە نێو شریتی charmەکان سەرەتا Setting پاشان Change Pc Setting و لە کۆتایی Personalize هەڵبژێرن. یەکەم کار ئەوەیە کە دەتوانن وێنەی پەڕەی داخستن (Lock) بگۆڕن.

بە واتایەک هەر ئەو پەڕەیە کە بە لێدانی windows+L ئەتوانن بچنە ژوورەوە. لەم بەشە لە ڕێکخستنەکان ئەتوانن ئەو وێنانە کە سوودی لێوەردەگرن ببینن، بەڵام ئەتوانن بە لێدانی دوگمەی Browse وێنە بە خواستی خۆتان لە هاردەکەتان هەڵبژێرن و Choose Picture کرتەبکەن.




٢-ئەتوانن دیاری بکەن کە زانیاری کام یەک لە پرۆگرامەکان لە پەڕەی داخستن نیشان بدرێت. بۆ نموونە ئامرازی Mail دەتوانرێت لەو پەڕەیە نیشان بدرێت کە چەند ئیمەیلی نەخوێندراوەتان هەیە تا ٧ بەرنامە دەتوانن زانیارییەکانتانی پێ نیشان بدەن.



بە شێوازی پێش بنەڕەت ئامرازەکان یان بەرنامەکـانی Calendar ،Mail،Messaging لەم شوێنە هەن. بەڵام دەتوانن بە لێـدانی دوگـمەی Plus و هەڵبژاردنـی بەرنامەکـان لە لیسـتی ئەم تایبەتمەنـدییە پاڵپشـتی بـکەن و پرۆگرامەکـانی تـایبەت بە خۆتـان هەڵبژێـرن. بـۆ ئەوە کە ئامرازەکان لە پەڕەی داخستن نیشان نەدرێن، ئەم ڕستەیە هەڵبژێـرن " Don't show quick status here ".




هەروەها دەتوانن ئامرازێکتان هەبێت کە وردەکاری زۆرتر نیشان بدات بۆ نموونە کاتی دوایین دیـداری ئێوە و هاوڕێکەتان لەکام کاتدابووە. لەسەر هێمای ئایکۆن کرتەیەک بکەن و ئامرازێک کە گەرەکتانە بەم شێوازە بێت لە لیستەکە هەڵبژێرن. بەڵام بۆ ناچالاککردنی ئەم تایبەتمەندییە ڕێکخەرەکە ناچالاک بکەن ڕستەی "Don't show detailed status on the lock screen" هەڵبژێرن.



٣-لەسـەر Start screen کـرتەیەک بـکەن و دەستنیشـانی بـکەن کە بەکـام شـێواز دەتانەوێـت ببینرێت. دەتوانن وێنەکانی پاشبنەما کە ویندۆز دەیخاتە بەردەستتان ببینن، بۆ ئەم مەبەسـتە لەسـەر وێنەچکۆلەکان لە هەر پاشبنەمایەک کرتەیەک بکەن بەداخەوە ناتوانن وێنەیەکی تر بـێجگە لەوەی کە ویندۆز بۆتانی هەڵبژاردووە وێنەیەکی تر هەڵبژێـرن. هەروەهـا دەتـوانن ڕەنگـی پەڕەی سـتارت لەم بەشە بگۆڕن.




٤-لە کۆتایی ئەتوانن وێنەیەک بۆ هەژماری بەکارهێنەری خۆتان هەڵبژێرن بـۆ ئەم مەبەسـتە لەسـەر Account picture کرتەیەک بکەن ئینجا کرتەیەک لە سەر دوگمەی Browes بکەن تـا وێـنەکە لەنێو کۆمپیوتەرەکەتان هەڵبژێرن یا دەتوانن کامێراکەتان لێبدەن و وێنەیەکی خۆتان بگرن و دایبنێن لەسەر وێنەی هەژمارەکەتان.



## ڕێکخستنی SKY Drive :

- خزمەتگوزاری  پاشکەوتی پەڕگەی مایکرۆسۆفت لە ویندۆزی ٨ یەکی باشی بۆخۆی داگیرکـردوە کە ئەتوانن پەرگەکان و بوخچەکان بە شێوازی سەر هێڵ پاشکەوت بکەن.

skyDrive خزمەتگوزاری پاشکەوتی مایکرۆسـۆفتە کە ٧ گیـگ بۆشـایی خـۆرایی بە ئێـوە ئەدات بێشک بەو بەکارهێنەرانە کە هەژمارەی مایکرۆسۆفتیان هەیە، زۆر جـار بە خێرایـی دێـتە خـوارەوە بەلاّم ئامرازێکی گونجاوە بۆ دەستپێگەیشتن بە پەرگەکان لە سەر هێڵ.

١ –ئـامرازیSkyDrive لە پەرەی سـتارت چـالاک بـکەن تـاکو بتـوانن بـرۆنە ئەو بەشـە کە بـۆ پاشکەوتی پەرگەکانتان سوودی لێوەردەگرن لێرە سێ بوخچە هەیە : documwnts، Pictuers، publics هرچەندە پێویست نیە وێنە بخەینە نێو  بوخچەی Pictuers بەڵکـوو ئەم کـارە دەبێـتە هۆی ڕێزبەندییێکی باشتر لە پەرگەکان.بە واتەیێک هەر پەرگەیەک لە شوێنی خـۆی .بەلاّم ئاگـادارین کە بوخچەی Public بە شێوازی ئاوەڵا لە ئینتەرنێت دیاری دەکرێت و بە گشتی دەتوانن بەدەسـتی بهێنن باش وایە ئاگادری ئەو پەرگانە بن کە دەیخەنە نێو ئەم (publics )بوخچەیە.




٢-بۆ بار کردنی  پەرگەکان و بۆخچەکان لە سـەر  sky  drive  بـوخچەیەک بـکەنەوە لە بەشـێکی کرتە بکەن وە لە جێگاییێکی ناو لە بوخچەکە کرتەیێکی راست بکەن( یا ئامرازەکانی تاچ سـکرین لە خوارەوە بێن بۆ نێوانی بۆشاییەکە )لێرە دەتوانن بوخچەیەک دروستبکەن یـان بیگـۆرن یـان بـاری بـکەن تەنـانەت شـێوازی بیـنن بـکەن بە thumbnail وdetails .




Skydrive بە شێوازێک داڕێژراوە هەروەک ئەوەیە کەلە سەر بوخچەیەکی ناو کۆمپیوتەرەکانی خۆتان کار دەکەن وە بە خێرایی پەرگەکان لە ناوی دا کوپی دەکەن.

دەمەوێت بوخچەیەک بە ناوی کوردستان دروست بکەم:




سەرەتا کرتەی ڕاست دەکەم تا مێنۆکانی سکای درایڤ دەردەکەوێت، پاشان لە سەر New folder کرتەیەک دەکەم پەنجەرەیەکی بچکۆلە دەکرێتەوە لە نێو خشتەکە ناوێک دەنووسم، پاشان کرتە لە سەر دوکمەی Create folderدەکەم.بەم شێوازەی لای خوارەوە :




٣-بۆ بەڕێوەبردنی پە ڕگەکان یان بوخچەکان لە سەر ئەوانە کە دەخوازن کرتەیەکی ڕاست بکەن(یان لە سەر ئامرازە لەمسیەکان پەنجەتان لە سەر ئایکۆنەکەی ڕابوەێستێنن)تا گۆڵبژێرەکان لە خوارەوەی پەرەکە ببینن لێرەدا ڕستەکانی Delet و Download(بۆ پەرگە) دەبینن لە سەر Download کرتەیەک بکەن تا پەنجەرەی پاشکەوت کردن بکرێتەوە تەنانەت دیاری بکەن کە پەرگەکە لە کوێدا پاشکەوت دەکەن پاشان Choose this folder لێیدەن بەم شێوازە پەرگەکە دادەگرێت(دادەبەزێت )-لێرەدا ئایکۆنی Downloadدەرناکەوێت بۆ ئەوە لە سەر بوخچە کرتەی ڕاستمان کردووە-.




٤-یەکێک لە باشیەکانی skydrive ئەوەیە کە دەتوانن پەڕگەکان و بوخچەکان بە خوازی خۆتان هاوبەشی پێ بکەن, بەڵام بەداخەوە ئەم توانامەندیە لەئامرازی skydrive لە ویندۆزی ٨ دا دابین نەکراوە. لە ویندۆزی ٨ دا تەنها دەتوانن پەڕگەکان و بوخچەکان ڕێکبخەن.ئەگەر دەخوازن بوخچە یان پەڕگەیەک لە ئینتەرنێت هاوبەش بکەن ئەتوانن بە ناونیشانی skydrive.live.com بڕۆن و بە ناوی کۆمپیوتەر و وشەی نهێنی خۆتان بچنە ژوور . لە سەر پەڕگەو بوخچەکان کرتەی ڕاست بکەن تا هاوبەشی (Sharing)بکرێت.بەم جۆرە کەسانی تر بەو پەڕگەو بوخچانەتان کە خۆتان هاوبەشیتان پێ کردوە دەستیان پێ دەگات و بە ناوەڕۆکی بۆخچەی Public کەتان. (وێنەی خوارەوە ناو هەژماری مایکرۆسۆفتە لە سەر وێبگەر نەک لە سەر ویندۆزی ٨)




بۆ باشترین کار کردن بە سکای درایڤ لە سەر هێڵ بڕوانە لاپەڕەی ٧٨ .

## کانفیگ کردنی بەرنامەکانی پێش بنەڕەت

ئەو پەڕگانە کە لە سەریان کرتە دەکەن دەتوانن لە بەرنامەکانی دێسکتۆپ و ئەبزارەکانی پەڕەی ستارت بکرێنەوە.بەم هۆیە جاری واهەیە کە پەڕگەکان لە شوێنێک لە ویندۆز دەکرێنەوە یان بە بەرنامەیێکی جیاواز کە پێتان خۆش نیە.لێرە فێری شێوازی کردنەوەی پەڕگەو گۆڕانی پەڕگەی پێش بنەمای ویندۆز دەبین.

هەر چەندە ئامرازەکانی پەڕەی دیسکتۆپی ویندۆز  لای زۆرێک لە بەکارهێنەر پەسەندن، بەڵام  بەرنامەکانی ئاسایی ویندۆز زۆر سادەترن بۆ نموونە photos لە پەڕەی ستارت رێگەدەدات کە تەنها وێنەیەک بکەنەوە کە بەبێ ئەوە ناتوانن لە نێو بوخچەی وێنەکانە بگەرێن، بەڵام بەرنامە  photo  Windows viewer ئەم توانایە دەرەخسێنێت کە بەکارهێنەر لە نێو بوخچەکان بگەرێن وە وێنە کانی ببینن.یان بە دوو کرتە لە سەر وێنە کە بەرنامەی فتۆشۆپ بکرێتەوە.ویندۆز رێدەدات کە بەکارهێنەر بتوانێت هەر پەڕگەیەک بە چ بەرنامەیەک ئارەزو دەکات بیکاتەوە.

١ – برۆنە ناو پەڕەی  ئیستارت و بنووسن **Default Programs**.  پاشان لە سەر ئامانجی گەڕان کرتەیەک بکەن لێرەدا ئامرازێک لە control panel دەکرێتەوە کە پێمان دەڵێت چ بەرنامەیەک بە شێوەی پێش فەرز کار دەکەن .




دوو شێوە بۆ گۆڕانی ئەم بەرنامانە هەیە یەکەمیان ئەوەیە کە رستەی Set your default program لیدبدن کە ئەو بەرنامانە کە لە کردنەوەی هێندێک پرۆگرام لە سەر پێش فەرز دانراون دەبینن .




بەم کردارە لیستێک لە بەرنامەکانی ناو ویندۆز دەبینن، کە دەتوانن هەر کامێکیان کە پێتان خۆشە هەڵبژێرن وە ئەگەر دەخوازن ئەو بەرنامە پێش فەرز بکەن، رستەی  Set this program as

default لێیدەن بۆ وێنە ئەگەر کار بە بەرنامەی فۆتۆشۆپ دەکەن ئەو پەرگانە کە بەم بەرنامەیە بە شێوەی پێش فەرز بە فۆتۆشۆپ دەکرێتەوە.




٢-هەر پێتان خۆشە بە وەردەکارییەکی باشتر هەڵبژێرن کە هەر بەرنامە چ کارێک ئەنجام ئەدات بەرنامەکە هەڵبژێرن و رستەی choose defaults for this programs هەڵبژێرن.




ئەم کردارە لیستێک لە پرۆتۆکۆل و پاشگرەکانتان نیشان ئەدات کە ئەو بەرنامە ئەتوانێت بیانکاتەوە.پرۆتۆکل بریتیە لە شتێک وەکوو ئادرەسی ویبەکان بۆ وێنە ئادرەسی وێبەکان لە سەر

فایر فۆکس ڕێکبخەن.وە هەر کات لە  سەر ئادرەسێکی وێب کرتە بکەن ئەو ئادرەسە لە سەر وێبگەڕی فایر فۆکسی دەکرێتەوە.لێرە هەر جۆرە پەرگەیێک پێتان خۆش بوو ئەتوانن بە دوو جار کلیک لە سەری بە بەرنامەی پێش فەرز بیکەنەوە، بۆنمونە من پێم خۆشە پەرگەکان بە پاشگری mp3 بە بەرنامەی windows Media Player بکرێتەوە یەکەم لە نێو بەرنامەکان لە لیستی لای چەپ ویندۆز مێدیا نیشانەدەکەم. پاشان لای ڕاست لە سەر ڕستەی choose defaults for this programs کرتەیەک دەکەمپاشگری mp3هەڵدەبژێرم دوکمەیSave لێدەدەم.




٣-ئەگەر بە پەڕەی **default programs**. بگەڕێنەوە ئەتوانن لە ڕەستەی Associate a file typ or protocol....ووس وەر بگرن.



بەم کارە لیستێک لە بەرنامەکان و پاشگرەکان دەکرێنەوە کە پێتان نیشان ئەدات هەر پەرگەیەک بە چ بەرنامەیێک دەکرێتەوە.لە سەر ئەو بەشەی کە هەتانە بیگۆڕن کرتەیێکی ڕاست بـکەن وە کـرتەیەک لەسەر change program دووکرتە بکەن، پاشان ئەو بەرنامەیەی کە پێتان خۆشە کە دەخوازن پاشگرەکەی بۆی دروست بکەن، دەستنیشانی بکەن.




ئەم کارە لە سەر وێبگەری ویندۆزیش ئەنجام دەدرێت، لە سەر پەرگەکە کرتەیەکی ڕاست بـکەن وە open with کرتەبکەن پاشان default هەڵبژێرن هەروەها بەرنامەی خوازیارتان هەڵبژێرن.

٤-لە کۆتـایی ئەگەر خوازیـارن وێـنەی بـۆ دیـاری بـکەن کاتێـک فـلاش مێمـۆریەک دەبەسـتن لە کۆمپیوتەرەکەتان یان دی ڤیدیێک دەخەنە درایڤەکەتان پاشان بڕۆنە ناو **default programs**. و ڕستەی change Autoplay setting کرتەبکەن.



لێرە ئەتوانن لە سەر بنەمای جۆری میدیاکەتان ( فلاش ودی ڤی دی و...) وە جۆری پەرگەکان(وێنەیی ، ڤیدیۆ ، مۆسیقا) هەڵبژێرن.لێرەش ئەتوانن دابینی بکەن ئەگەر دی ڤی دی یان فلاشێک پر لە وێنە یان فیلم بوو جوولەی وێندۆز چۆن بێت(لەم دوو بارەدا )




| | |
|---|---|
| Import photos and videos(photos) | نیشاندانی وێنەکان وڤیدیۆکان(وێنەکان) |
| Play(Windows Media Player) | لێدان بە نەرمەواڵەی میدیا پلەیر |
| Take no action | کردار ئەنجام مەدە |
| Open folder to view files (file explorer) | ئاوەڵاکردنەوەی بوخچە بۆ دیتنی پەرگەکان |
| Ask me every time | پرسیارم لێ بکە هەموو کاتێک |
| Install or run program from your media | دامەزراندن و وەگەرخستنی بەرنامە لە مێدیاکەتان |

## پاڵپشتی لە کۆمپیوتەر

هەر چەندە ویندۆز ٨ جێگای متمانەیە بەڵام کاتێک هەڵە یان سڕینەوە یێک لە سیستەمم روو دەدات و پێویستمان بە گەڕانەوەی پەڕگەکانە و هیچمان لە بەر دەست نەبێت کارێکی قورسە. لەم بەشە شێوازی پاڵپشتی لە زانیاریەکان فێر دەبین. ویندۆز لە هەر فێرژێنێکی خۆی نیشانداوە کە جێگای متمانەیە بەڵام کاتێک رەقەکالایەک خراب بێتپەڕگەکان بسڕنەوە، بەرنامەیەک هەنگ بەکات و بێت بە هۆکارێک بۆ زەرەرگەیاندن بە کۆمپیوترەکەمان.ویندۆز ٨ ئامرازێکی دروست کردووە کە توانایی پاڵپشتی کردن لە بەرنامەکان هەیە کە بە بەراوەرد لەگەڵ ویندۆزی٧ گۆڕانکاری باشی پێکهاتوە.بۆیە ئەم نەرمەواڵەیە دەبێت دراڤێک بۆ گەڕانەوەی(recovery) دروستبکەیت.دەتوانن پاڵپشتی لە بۆشایی هەوریش دابنێن هەروا یان لەکاتی خراپی کار کردنی ویندۆز بە بەرنامەی System restore (لە ویندۆزی ٧یش هەیە ) کۆمپیوتەرەکەتان بگەڕێنەوە بۆ شێوازی پاش خراپ بوون.

١-هەمیشە لە کۆمپیوتەرەکەتان پاڵپشتی بگرن تا کاتێک بار و دۆخی کۆمپیوترەکەتان بە باشی بەرەو پێش نەچوو پەڕگەکانی ویندۆزی ساغەکانتان بگەڕێنەوە وە ئیتر پێویستان نیە کە ویندۆز جارێکی تر دامەزرێنن.لە ویندۆزی ٨ دەبێت بچن بۆ پەڕەی ئێستارت بنووسن Windows7. لە سەر Setting کرتەیێک بکەن و Window7 file recovery هەڵبژێرن.یان بڕۆنە ناو control panel و Window7 file recovery هەڵبژێرن




لەم کاتەدا پەڕەی پاڵپشتی ویندۆز ٧ دەکرێتەوە وە لە سەر ئەو ئەتوانن کاتێک بۆ پاڵپشت گرتن لە کۆمپیوتەرەکەتان دابین بکەن یان ئیمەیجێک بگرن.



لە ســەر set up backup کرتەیێـک بـکەن چـۆن لەم شـێوازە سیســتەمی پاڵپشــتی وینــدۆزی ٨ دەستتێدەکات[بەڵام ئێوە ئەم کارە مەکەن]. هەر وا ئەتوانن بەرنامەی باشکردن یان خۆد چاکسـازی وینـدۆز ٧ لە سەر دی ڤی دیێک دروستبکەن بە هۆی ئەوە کە ویندۆز ٨ تەنیا لە سەر فلاش مێموری کار دەکات.




٢-بۆ گرتنی پاڵپشـتیێکی تەواو لە وینـدۆزی ٨ەکەتـان لە ســەر Creat a system image کرتەیێـک بکەن.




لێرە ئەتوانن شوێنی پاڵپشتی ویندۆزەکەتان دیاری بکەن :هاردیسکێکی جیـاواز و خێـرا ( خێـرا و ئاسان بەڵام پێویستی بە هاردێکی دەرەکی هەیە ) یان یەک یا چەندانە دی ڤی دی ( ئەم کـارە زۆر دژوارە ) وە یان لە سەر نێت (تۆر) ئەمیش کاتێک کە درایڤی NASتان هەبێت بۆتان باشە گەر ئەم رستەیە هەڵبژێرن لە سەر Select کرتەیێـک بـکەن وە Browse لێبـدن تـا دەزگـا پشـتیوانگیری

دابین بکات. کاتێک کە ڕێکخستنەکانتان ئەنجام دا لە سەر NEXT کرتەیێک بکەن ویندۆز ٨ بە ئێوە نیشان ئەدات کە لە کام درایڤ پاڵپشتی دەگرێت، لە سەر START BACK UP کرتەیێک بکەن تا ویندۆز کاری خۆی ئەنجام بدات. ئەم کارە ماوەیێک ئەخایەنێت کە پەیوەندی بە ژمارە و قەبارەی پەرگەکانتانەوە هەیە لە ناو کۆمپیوتەرەکەتان.




٣-ویندۆز ٨ بۆ پاڵپشتی لە پەرگەکان بەرنامەیێکی هەیە بە ناوی File History کەهەر وەک Time Machine ئەپڵە وە وشانێکی جیاواز لە پەرگە گرنگەکانی ئێوە هەڵدەگرێت تا هەر کات پێویستتان پێیان بوو پەرگەکانی بگەرێنەوە بۆ وەشانی پێشتر. دوگمەی ویندۆز لێبدەن تا پەڕەی ئێستارت بکرێتەوە بنووسن File History پاشان Setting لێبدەن وە File History هەڵبژێرن.یان لە پەنجەرەی Window7 file recovery کار بەم بەرنامەیە بکەن .




ئەم بەرنامە تەنیا کاتێک کار دەکات کە هاردێکی دەرەکی (ئێکسترناڵ) بەسترابێت بە کۆمپیوتەرەکەوە یان ڕەقەواڵەیێکەتان بۆ پاشکەوت لە سەر رایلە هەڵبژاردبێت یان دابینتان کردبێت.لە شێوازی دووەم

ئەبێت ڕێکخستنەکان کە شێوازێک لە پلەی یەکەم وتمان ئەنجام بدەن ئەگەر دەخوازن لە هاردێک ئێکسترناڵ سوود وەر بگرن بەڵام هێشتا نەتان بەستوە، پێویستە بیبەستن وەF5 لێبدەن یان لە سەرrefresh کرتەیێک بکەن.




٤-بەرنامەیfilehistory بە شێوەی خۆکار پەرگەکانی کتێبخانەکان و دێسکتۆپ وcontactsوfavourites پاڵپشتی دەکات.ئەتوانن بۆخچەی نوێ بە کتێبخانە زیاد بکەن .ئەگەر پێتان خۆشە بوخچەیێک لە پرۆسەی پاڵپشتی دوور کەنەوە لە سەرexclude folder کرتەیێک بکەن ئینجا add لێبدەن وە بوخچەکە دیاری بکەن ئەمە بۆ کاتێک باشە کە پەرگەی زۆرتان بە قەبارەی گەورە هەیە وپێتان خۆشە خۆتان بە جیاواز پاڵپشتی لێبکەن. (بۆ نموونە لە وێنەی خوارەوە بوخچەی کوردئای تی پی گرووپم پێ زیاد کردووە )




٥-لە سەر Advanced setting کرتەیێک بکەن تا بتوانن بە باشی بەرنامەکە ڕێکبخەن بۆ وێنە هەر چەند جارێک، جارێک لە پەرگەکان پاڵپشتی بکەن .هەروەها بە شێوەی پێش فەرز کاتژمێر تەرخان کراوە بەڵام ئەگەر لە سەر پەرگە گرینگەکان کار دەکەن ئەتوانن کات زۆرتر و قەبارەی کەشی دەرهێڵ دابین بکەن.



ئەم بەرنامە بۆ کاتێک باشە کە شوێنی پاشکەوتی ( ئێکستێرناڵ یـان رایـڵەی ) لە بەر دەسـت نـیە ویـنـدۆز دەیەوێت پەرگە کان لە سەر ئەو هاردە پاشکەوت بکات . لەم حاڵەتە دەتـوانن زۆرتـرین بۆشـایی پاشـکەوتی پەرگە دابین بکەن ئەمە تایبەتە بە نۆت بووکەکان.لەکۆتایی دا دەتـوانن کـۆنە پەرگەکانتـان دیـاری بـکەن کە تاکو چەند بمێنێتەوە. بۆ رەستەی forever بۆ هەمیشەییە بەڵام دەتوانن کاتێکی تریشی بۆ دەستنێشـان بکەن.




هەروەها دەتوانن پەرگەی پاشکەوتە کۆنەکە لە ڕێگای Clean up versions بسرنەوە.




لە کۆتـایی دا لە سـەر Save change کرتەیێـک بـکەن وە لە file history بەشـی turn on کرتەبکەن. تـا بەرنـامەی پاڵپشـتی چـالاک بـکەنەوە. ویـنـدۆز لێتـان دەپرسـێت کە ئایـا پێتـان خۆشـە کە

هاردەکەتان بۆ پاڵپشتی گرتن بە ئەندامەکانی تری رایڵە پێشنیار بکرێت.بەڵام باش وایە هەر کۆمپیوتر بۆ خۆی پەرگەی پاڵپشتی ئەنجام بدات.

٦-بۆ گەڕانەوەی پەرگەکان دەبێت پەنجەرەیfile history بکەنەوە وە restore personal file کرتە بکەن، بەم کارە دوایین پاڵپشتیتان بۆ دەگەڕێنێتەوە و کات و رۆژمێری پاڵپشتیتان پێ نیشان دەدات .






ئەتوانن بە دوکمەی پێش و پاش بچن بۆ وشانێکی کۆنی پاڵپشتی هەروەها دەتوانن بڕۆنە نێو پەرگەو بوخچەی پاڵپشتی وناوەوەی ببینن و بەکرتەی راست تەنیا بە ئێوە ئەو توانایە ئەدات کە ئەو پەرگەیە یان بوخچەیە بگەڕێنەوە هەر وا توانایی دیتنی ناوەرۆک(preview) وە پاڵپشتی پەرگەکان بە ناوێکی تر(resotre as) ئەنجام بدەن.ئەم توانایە بۆ کاتێک باشە کە خوازیارن کە پەرگەی پاڵپشتی بدەن بە سەر ئەو پەرگە کۆنەتان دا.کرتە لە سەر دوکمەی گەڕانەوە (Restore) بکەن تا تەواوی بوخچە وپەرگەکان لە کاتی ئەو پاڵپشتیکردنە بگەڕێننەوە.



٧-ئەگەر کێشەیێک بۆ کۆمپیوتەرەکەتان دروست بێت پێتان خۆشە کە بە شێوازی mode safe وینـدۆز بهێنـە سەرەوە تا کوو درایڤەکان و بەرنامە خراپەکان بسڕیتەوە.بەداخەوە ئەم کارە لە ویندۆزی ٨ ئاسان نیە وە لە کاتی هاتنە سەرەوەی ویندۆز تەنیا 200 میلی چـرکە دەرفەتـان هەیە تـاکوو دوکـمەیshift+f8 لێبـدەن وە بڕۆنە نێو مێنۆی پەیوەندیدار، بۆ ئەم مەبەستەش چەند جارێک کۆمپیوتەرەکەتان ریسـتارت بـکەنەوە.ئەگەر کۆمپیوتەرەکەتان بووت نەبێت ویندۆز خـۆی دەخاتە نێـو حـاڵەتیAutomatic repair وە هەوڵ ئەدات کێشەکان بڕەوێنێتەوە. لێرەدا رەستەیsystem restor بۆ گەڕانەوە بە باری پێشتری ویندۆزتان هەیە. هەروەها ئەگەر دەتـوانن بـڕۆنە نـاو وینـدۆزەکەتان بە Setting pc بـڕۆن General کـرتەبکەن و مێنـۆی start-up لە Advanced سـەر now Restart کـرتەیەک بـکەن.لە رەسـتەکان لە سەر troubleshoot و Advanced options و پاشان start-up-setting کرتەیەک بکەن لەم کاتەدا مێنۆی تری بووت بڕیتیە لە safe mode.

٨-ئەگەر دەزانن کە ناتوانرێت چاکسازی بکەن بەو ڕێگایەی لە سەرەوە باسمان کرد، ئەوا دەتـوانن کە درایڤی ڕیکەفەری فلاشە کەتان لە کۆمپیوترەکەتان ببەستن و دڵنیا بن کە بووتی بـایۆس لە سـەر فـلاش دێتە سەر، پاشان کاتێک ویندۆزەکە کەوتە گەڕ ئەم پەڕگەیە نیشان دا mow install ئەوا کرتەبکەن لە سەر رەستەی**Repair your computer** وە پاشان Troubleshoot هەڵبژێرن .




رەسـتەی setting Pc your refresh سـەرجەم پەڕگەکـانی کۆمپیـوتەرکەتان نـوێ دەبێـتەوە دەگەڕێنێتەوە بۆ دۆخی سەرەتایی دەست بەکاربوونی ویندۆزەکەتان بۆ باشترین باری کارکردنی.



System restor ڕێگەتان پێ ئەدات کە کۆمپیوترەکەتان بگەڕێتەوە بۆ یەکێک لەبارەکانی پێشـوتردا. گەر پێتان خۆشە کۆمپیوترەکەتان بە پەرگەی ئیمەیج بگەڕێننەوە، ئەوا لە سەر Advanced options کرتەیێک بکەن.




وەsystem image recovery کرتەبکەن، بەم شێوازە ئیمەیجەکان کە گرتووتانە پیشـان دەدرێـن هەروەها دەتوانن ئیمەجەکان کە لە سەر هاردەکانتان یـان ئامێرەکـانی رایەڵە گرتووتانـە هەڵبژێـرن لەم بەشە ویندۆز چەند پرسیارێکتان لێدەکات پاشان ئیمەیج دەگەڕێتەوە.



## قەدبڕەکانی ویندۆزی ٨

زۆربەی  تواناکانی ویندۆزی ٨ یان لە ڕێگای مشک یان تەچ سکرین بە ئەنجام دەگەیەنرێت، گرنگی فێربوونی قەد بڕەکان لەوەدایە کە کارەکانمان دەتوانین بەخێراییەکی زۆر بەئەنجام بگەیەنین.

### قەدبڕەکان بەشیcharm :

| | | | |
|---|---|---|---|
| تەواوی charlmەکان | +C | گەڕان لە پەرگەکان | +F |
| تەواوی CHARMەکانی پێش فەرز | +Q | چارمی ڕێکخستنەکان | +I |
| ڕێکخستنی گەڕان | +W | پەرەی ستارت | |

### قەدبڕەکان تەختە کلیل :

| | |
|---|---|
| کردنەوەی وێبگەڕی ویندۆز | +E |
| قفڵ کردنی کۆمپیوتر | +L |
| پیشاندانی پەنجەرەی Run | +R |
| جێبەجێیی لە نێوبەرنامەکان | +Tab |
| گەورەکردنی پەنحێرەی بەرنامەکان | +↑ |
| بچوکردنی پەنجەرەی بەرنامەکان | + ↓ |

**گواستنەوەی بەرنامەکانی هەڵبژاردراوەی ویندۆز بۆ پسشانگەرێکی دیکە :**

**+shift+⟶ +shift+⟵**

**نیشاندانی تەختەی دێسکتۆپ ئەم کارە تەواوی پەنجەرە کراوەکان بە شێوەیەکی بچوک پیشان ئەدات : + D**

**کردنەوەی مێنۆی خێرای دێسکتۆپ کە دەستپێگەیشتن بە کۆنترۆڵپانێل وە بەشەکانی پیشان ئەدات : X +**

**بردنی پەنجەرەی هەڵبژێراو بۆ لای راست وچەپ یان ناوەراستی دێسکتۆپ پیشان ئەدات → + ←+**

**پەڕەیەک بەرەو بۆ دوواوە رویشتن** Back pace
**ئەمە لە ئینتەرنێت ئیکسپلۆرێر و وێبگەری ویندۆز کار دەکات.**

## دامەزراندنی تۆڕی ناوخۆیی:

توانایی home group لە ویندۆزی ٨ ساکار تر بووە وە بە سانایی ئەتوانن پەڕگەکان و پرینتەرەکان هاوبەشی پێبکەن.

١ – تەواوی کۆمپیوتەرەکان کە خوازیارن لە گەڵیان پەڕگە وبوخچە هاوبەش بکەن بیخەنە نێو Home grupێک .ئەگەر home groupێکی ویندۆز ٧تان لایە ئەشێ وشەی نهێنیەکەتانیش بێت لە کۆمپیوترێکی ویندۆز ٧ بچنە نێو کونترۆڵ پانێلەکەی وە Home group لەشریتی گەڕان بنووسن و ئینجا لە سەر Home group کرتەیێک بکەن وشەی نهێنی بە ڕەستی view or print ببینن وبینووسن.گەر لە ڕایەڵەکەتان Home group تان نیە بچنە PC setting وHome Group بەشی Membership چاو لێبکەن.لەوێ ئیمکانی هەیە کە Home groupێک دروست بووە.وشەی نهێنی بنووسن یان لە بیری بکەن.




بەڵام هەر نەتاندی لە سەر یان پێتان خۆش بوو وشەی نهێنی نوێ بنووسن لە سەر Leaveکرتەیەک بکەن ولە سەر دوکمەی Create کرتەیەک بکەن ڕێگەبدەن کە کۆمەڵێک یان گروپێک درووست بێت و وشەی نهێنیەکەی لە سەر لاپەڕەیەک بنووسن.



٢–ئێستا دەبێت لە سەر کۆمپیوترێکی تر بە Home group لەپەیوەند دا بن بۆ ئەم کارە لە کۆمپیوترەکەی ویندۆزی ٧ بڕۆنە ناو کونترۆڵ پانێڵ ، Homegroup لە نەواری گەڕان بنووسن وە لە سەر Homegroup کرتەیەک بکەن.ئێستا Now join لێبدەن وە کرتەیەک لە سەر دوگمەی Next لێبدەن روونی بکەن چ کتێبخانەیێکتان گەرەکە هاوبەش بکەن وە Next لێبدەن وشەی نهێنی کە لە قۆناعی یەکەم لە سەر لاپەڕەیەک نووسیوتانە بینووسن و next لێبدەن.

بۆ پەیوەندی بە کۆمپیوتەرێک لە ویندۆز ٨بە homegroup بڕۆنە نێو setting pc وە لە سەر home group کرتەیەک بکەن وشەی نهێنی کە لە قۆناغی یەکەم نووسیوتانە لێرەدا بینووسن وە join لێبدەن ئێستا ئەتوانن دیاری بکەن کە چ کتێبخانەیەک هاوبەش بکەن.ئایا دەخوازن دەزگاکانی تریش هاوبەش بکەن.

٣–بۆ هاوبەشکردنی بوخچەیەک بچنە ناو وێبگەری ویندۆز لە سەر ئەو بوخچەیەی کە دەخوازن هاوبەشی بکەن کرتەیەکی راست بکەن پاشان share with هەڵبژێرن کە دەتوانن homegroup(view) هەڵبژێرن تا ئەندامانی تر یان بەکارهێنەرانی تر تەنیا بتوانن ئەو بوخچە ببینن لەم بارەدا ئەوان ناتوانن ئەو بوخچە بسڕنەوە یان بیگۆڕن.بەڵام رەستەی (home group(view and edite بە کاربەران رێدەدات کە بوخچەکە ببینن و دەشتوانن کە دەستکاری بکەن. بەم جۆرە پەرگەکانی ئێوە لە نێو تەواوی کۆمپیوتەرەکان تۆرەکەتان لە مێنۆی Home group لە سەرەوەی وێبگەری ویندۆز دەستپێگەیشتنی هەیە.




٤–ئەم شێوازی هاوبەشکردنە ناتوانین بۆ وێندۆزەکانی پێش٧ و سیستەمەکانی کارپێکردن وەکوو MacOs X ئەنجام بدەن.بەڵام دەتوانیت پەرگەکان بۆ هەر کاربەرێک هاوبەشی پێبکەیت.وە بۆ ئەوە کارئاسانی ئەو هەژمارەی بەکارهێنەر و وشەی نهێنی کە لە کۆمپیوتەرێکی دیکە هەیە لە ویندۆزی ٨ دروستی بکەن، بۆ ئەو مەبەستەش لەسەر بوخچەیەک کرتەی راست بکەن و share with و specific people لێبدەن. هەر بە کارهێنەرێک کە خوازیارن لە مێنۆ هەڵبیژێرن وە add لێبدەن.بۆ هەر بەکارهێنەر ئەتوانن ئاستی دەستپێگەیشتن لە سەر read/write(نووسین/خوێندن) یان تەنیا read(خوێندن)ڕیکبخەن.Remove بەکارهێنەر کە هاوبەشتان کردووە دەیسڕێتەوە و ئیتر ئەو پەرگە یان بوخچەی بۆ نابینرێت.




٥ – بۆ دەستپێگەیشتن بە بوخچەکان بە شێوازی قۆناغی ٤ ئەشێ سەرەتا ip کۆمپیوتەری ئێستای خۆتان(کە ویندۆزی ٨ ) هەیە بنووسن.بۆ ئەم کارە سەرەتا دوکمەکانی Windows+X لێبدەن.Command Prompt هەڵبژێرن .




IPconfig بنووسن وە Enter لێبدەن.ئینجائادرەسی ipv4 کە دەردەکەوێت بینووسن.بڕۆن نێو کۆمپیوتەرێکی تر وە Network بکەنەوە تا کۆمپیوتەرێک کە ویندۆزی ٨ لە سەر دامەزراوە ببینن و لە سەری دوو جار کرتە بکەن.ئەگەر هەژمارەی بەکارهێنەری ناوخۆیی ئێوە هەر ئەو زانیاریانەی هەژمارەی بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەری ٨ی هەیە رێی دەستپێگەیشتنی هەیە.بێجگە لەمە ئەبێ ناوی بەکارهێنەر و وشەی نهێنی یەکێک لە هەژمارەکانی ویندۆزی ٨یش بنووسن.ئەگەر لە ویندۆز ٨ هەژمارەی مایکرۆسۆفت سوود وەردەگرن ناونیشانی ئیمەیڵ و وشەی نهێنی بنووسن.ئەگەر

کۆمپیوتەری سیستەمی کارپێکردنی ویندۆزی٨تـان نـیە Windows+R لێبـدەن و \\ip بنووسـن(بە جێگای ip ناونیشانی ipێک کە نوسیوتانوو بینوسن) وەEnter لێبدەن.ئینجا ناوی بەکـارهێنەر و وشەی نهێنی بەو جۆرە کە ئاماژەمان پێکرد بنووسن. ئەم کارە بـو سیسـتمی کـارپێکردنی مـاک و لینوکسیش ئەتوانن ئەنجام بدەن.تەنیا ئادرەسی IP بەجێگای ئادرەسی سێرڤێر بنووسن.






## فێڵەکانی ویندۆزی هەشت:




### ١- گرتنی وێنە لە شاشە :

لە وشانی کۆنەی ویندۆز بە کرتە کردن لە سەر دوکمەی Print PrtScr وێنەیەکی لە شاشەکە لە مێمۆری پاشکەوت دەبوو پاشان دەبوایە بەبەکارهێنانی یەکێک لە نەرمەواڵەکانیPaint یاWord داماننایێت(paste).بەڵام لە ویندۆزی ٨ وەکوو وەشانی کۆنە کلیلی Win + PrtScr وێنەیەک لە شاشە یان پەنجەرەی چالاک لە سەر شاشە دەگرێت بەڵام خۆکارانە لە نێو بوخچەی Picture باشکەوتی دەکات.

### ٢- پاڵپشتی لە درایڤی خەیاڵی:




لە ویندۆزی ٧ ئەتوانین پەرگەکانی iso رایت بکەین بەڵام بۆ سوود وەرگرتن لە پەرگەکانی iso پێویست بوو نەرمەواڵەیەکی تایبەت بە خوێندنەوەی ئەم جۆرە پەرگانە هەبوو کە دایبەزرێنین لەسەر کۆمپیوتەرەکانمان درایڤێکی خەیاڵی بۆ دروست دەکردین و پاشان لە ڕێگەی ئەم درایڤە خەیاڵیەوە دەمانتوانی پەرگە iso کان ببینین، بەڵام لە ویندۆزی ٨ سەرباری ئەوەی کە دەتوانین پەرگەیێکیISO رایت بکەین دەتوانین درایڤێکی خەیاڵیشمان ببێت.بۆ ئەم کارە ئێوە دەتوانن لە سەر پەرگەی ISO دووبار کرتەیێکی راست بکەن وە وشەی Mount هەڵبژێرن تا ویندۆز درایڤی خەیاڵی بۆ ئێوە دروست بکات.هەروەها بۆ پەرگەکانی VHD - کە وەشانێکی خەیاڵی لە هارد هەن کە لە لایەن ماشینە خەیاڵیەکان وەکوو Hyper-v وە Pc Virtual سوودیان لێوەردەگیرێت - ویندۆز تەنها بە دوو جار کرتە لە سەر ئەوان بە شێوازی خۆکار درایڤێک بۆ ئەوان دەناسێت بۆ سرینەوەی ئەم درایڤانە تەنها کرتەیەکی راست بکەن وە Eject هەڵبژێرن.

### ٣-چالاک کردنی Hibernate :

توانای Hibernate بەشێوەی خۆکارانە لە ویندۆزی ٨ چالاک نیە بەڵام دەتوانین بە شێوازی خوارەوە چالاکی بکەین: سەرەتا کلیلی Win+W لێبدەن پاشان وشەی Power بنووسن پاشان لە

سەر ڕەستەی Change What the power botton do کرتەیەک بکەن.لە پەرەی کراوە لە سەر Change setting that are Currently unavailable کرتەیەک بکەن تا بەشی Shutdown settingچالاک بێت. لەم بەشە Hibernate هەڵبژێرن.




### ٤-دامەزراندن لە هەر جێگەیەک بمانەوێت :

وەکوو سیستەمە کارپێکردنەکانی تر  بە شێوەی خۆکارانە لە ویندۆز ٨ توانایی دامەزراندنی بەرنامەکان تەنها لە ڕێگای app storeی خۆدی ویندۆز هەیەبەڵام ئەتوانین بە ناچالاک کردنی ئەم تایبەتمەندیە بەرنامەکان لە جێگەکانی تردا دامەزرێنین، بۆ ناچالاک کردنی ئەم کردارە سەرەتا Run لە ڕێگای کلیلەکانی Win+R بکەنەوە ئینجاGPEdite بنووسن وە کلیلی Enter لێبدەن وە لە پەنجەرەی کراوە برۆن بۆ ئەم ناونیشانەی لای خوارەوە :

Computer Configuration >Administratrative Template>Windows Component>App Package Deployment

لە سەر Allow all trusted apps to install دووبار کرتەیەک بکەن، پاشان Enable هەڵبژێرن و لە کۆتایی دا لە سەر ok کرتەیەک بکەن.






٥-لە ویندۆزی ٨ کاتی نیشاندانی هەڵە پێویست بە پەیوەندیکردن بە ئینتەرنێتەوە ناکات، وە تەنها دوگمەی Ctrl+C لێبدەن وە دەقی هەڵەکە لە نەرمەواڵەکانی Notepad و (دابنێن)Paste بکەن.

### ٦- چوونەژوورەوەی ڕاستەو خۆ بۆ دیسکتۆپ:

توانایی چوونەژووری ڕاستەوخۆ بۆ دیسکتۆپ بوونی نیە بەڵام ئەم کارە دەتوانین لە چەند بەرنامەیەکی جیاوازدا ئەنجام بدەین، لێرەدا دەتوانین باس لەشێوازێک بکەین کە پێویست بە هیچ بەرنامەیێک ناکات.

- کلیلەکانی Win+W لێبدەن ئینجا schedule بنووسن وە ڕستەی Tasks Schedule هەڵبژێرن.

- لە قەراخی ڕاست، Task Creat هەڵبژێرن و لە بەشی Name ناوێک بە خوازی خۆتان بنووسن لە خوارەوە ڕستەی Configure For بە Windows 8 بگۆڕن.

- لە سەرپەرەی Triggers کرتەیەک بکەن، پاسان لە سەر دوگمەی New کرتەیەک بکەن، لەو پەنجەرەی کرایەوە لە بەشی Begin the task لە سەر On a scedual کرتەیەک بکەن لە لیستی کراوە At a log on هەڵبژێرن. دوای ئەم قۆناغانە لە سەر OK کرتەیێک بکە.

- لە سەرپەرەی Action پاشان New کرتەیەک بکەن لەو پەنجەرەیەکە دەکرێتەوە و لە ڕێگای دوگمەی Browse پەرگەی explorer لەم ناونیشانەی لای خوارەوە هەڵبژێرە :

C:\Windows\explorer.exe

- لە کۆتایی OK لێبدەن.




## ٧- قەدبرێک بۆ کوژاندنەوەی سیستەمەکەت :

ڕێگای ئاسایی کوژاندنەوە یـاخود shutdown لە ویندۆزی ٨ کەمێک درێژترە بەڵام ئێوە ئەتوانن لە ڕێگای یەکێک لە شێوازەکانی خوارەوە ئەم ڕێگا کورتبکەنەوە :




- لە دیسکتۆپ بە کرتە لە سەر کلیلەکانی ALT+F4 پەنجەرەی Shoutdown Windows بکەنەوە وە لە ڕێگای ئەم پەنجەرەیەوە دەتوانن ویندۆز بکوژێننەوە.

- لە دیسکتۆپ کرتەی ڕاست بکەن.سەرەتا New پاشان Shortcut هەڵبژێرن. لەپاشان دا لە پەنجەرەی کراوە بە سوود وەرگرتن لە Browse پەرگەی Shutdown.exe ئەم ناونیشانەی لای خوارەوە هەڵبژێرن

C:\Windows\system32\shutdown.exe




پاشان لە پێش ناونیشانەکەی ڕستەی 0 t / s/ زیاد بکەنە کۆتایی لە سەر next وە Finish کرتەیەک بکەن. دەتوانن بە کرتەی ڕاست لە سەر قەدبری و هەڵبژاردنی ڕستەی Start Point پەرگەی قەدبڕ بێنن بۆ پەڕەی screen Start پاشان بە گۆڕانی s/ بە r/ بۆ ریستارت وە یا h/ بە بۆ Hibernateکردن دەتوانن ڕێکخستەکانی پێویستانە ئەنجامی بدەن.



**٨-لە نوێ کردنەوە ویندۆز ئیکسپلورەر :**

کاتی وا هەیە کە Windows Explorer دووچاری کێشە دەبێت یان بەشێک لە ریجێستری دەگۆڕن وە دەخوازن لەو کاتەدا ئەم گۆڕانکاریە پیشان بدرێت لەم کاتەدا پێویستە Windows Explorer دووبارە کاربکات و بکەوێتەوەگەڕ.

بۆ نوێکردنەوەی Windows Explorer سەرەتا Ctrl+Shift+Esc کرتەبکەن تاکو Task Manager بکرێتەوە.پاشان بڕۆنە سەرپەڕی Process وە لەو لیستە.Windows Explorer بدۆزنەوە، پاشان لە سەر ئەو کرتەیەک بکەن لەکۆتای دا Restart هەڵبژێرن.



## تۆمارکردنی هەژمارەی مایکرۆسۆفت

سەرەتا دەچینە ناو یەکێک لەم دوو ماڵپەڕە:

www.outlook.com

www.hotmail.com




لە سەر ڕەستەی Sign up now کرتەیەک دەکەین تا بچینە ناو فۆرمی خۆتۆمارکردن.فۆرمی مایکرۆسۆفت بۆ تۆمار کردن لە چەند بەش پێک هاتووە کەچەند پرسیارێک لە بەکارهێنەر دەکات :

١-ئێوە کێن ؟ Who are you?

٢-چۆن پێت خۆشە خۆت تۆمار بکەی (زانیاری هەژمارە)How would you like to sign in

٣- گەر وشەی نهێنیت بزر کرد چۆن یارمەتیت بدەین ؟ If you lose your password, how can we Help you reset it?

٤-خەڵکی کوێی (شوێنی حەوانەوەت)Where are you from?

٥-دڵنیامان بکە کە تۆی بەکارهێنەریت، کە ڕۆبۆت یان سپەم نیت Help us make sure you're not a robot

**شرۆفە:**

**لە بەشی ژمارەی ١** ئێوە ناو- Name-(First-Last)بەرواری لەدایک بوون بە ڕۆژ و مانگ و ساڵ Birth date (Month-Day-Year)ڕەگەز:Gender (Male -female)تۆمار دەکەن.

**لە بەشی ژمارەی٢** ئێوە هەژمارەی مایکرۆسۆفتەکەتان دیاری دەکەن( Microsoft account name)کە دەتوانن لە دوو شێوە یەکێک هەڵبژێرن یان Hotmail.comبێت یان Live.com لە.

خشتی Create a password وشەی نهێنی دیاری دەکەن کە نابێت لە ٨ پیت کەمتر بێت(باش وایە لە ژمارە ، پیت وسەمبۆڵ سوود وەربگرن)

**لە بەشی ژمارە٣** ئێوە دەتوانن ژمارە تەلەفۆنەکەتان بنووسن (Phone number)یان یان هەژمارەی ئیمەیلێکی تر بێجگە لە هەژمارەی مایکرۆسۆفت (Alternate email address) یان پرسیاری ئاسایش هەڵبژێرن(choose a security question)کە بریتیە لە ناوی مامۆستای خۆشەویستت شوێنی لەدایک بوونی دایکت هاوڕێی دەورانی منداڵیت و...هتد. وەڵام نابێت لە ٥ پیت کەمتر بێت .

**لە بەشی ژمارەی ٤** لە بارەی شوێنی نیشتەجێت پرسیارت لێدەکات
وڵات/دەڤەر(Country/region)کۆدی پۆست(ZIP code)

**لە بەشی ژمارە٥** دەبێ کۆدی ناو وێنەکە لە نێو خشتەی خوارەوە بنووسیت( Enter the characters you see)دەتوانی ئەگەر سادە نیەوە دژوارە New لێبدەیت یان بە شێوازی دەنگ Audio بیبیستی وبینووسیت.

لە کۆتایی دوکمەی I accept لێدەدەیت و خۆت تۆمار دەکەی .دەچیتە نێو هەژمارەی Hotmailەکەت




لە سەر ڕەستەی Hotmail(لە قەراخی سەرەوە لای چەپ)کرتەیێک دەکەی تا دەچیتە نێو هەژمارەی مەیلەکەت تا دەچیتە پەڕەی خوارەوە وە لە سەر Update nowکرتەیێک دەکەیت تاوشانی نوێ خزمەتگوزاری سەرهێلی مایکرۆسۆفت(Outlook)ت بۆ دامەزرێت.




ئەگەر بە ناونیشانی outlook.com خۆت تۆمار بکەیت ئەم نوێکاریەت پێویست نابێت.یان لێکی بدە بە ناونیشانی outlook.com برۆ وهەژمارەکەت بەکاربهێنە بەوشێوازەی دروستان کردوە، وە بۆ چوونەژوورەوەت تۆماری بکە، پاشان دەچیتە وەشانی نوێی هەژمارەی مایکرۆسۆفت بە رووکاری مێترۆی ویندۆز ٨ .



خزمەتگوزاریەکانی "Outlook " لە چوار بەش پێک هاتوە ١-بەشی ئیمەیل یان پۆستی ئـە لکترۆنـی مایکرۆسۆفت ٢-خەڵک ٣-ڕۆژمێر ٣-درایڤی هەوری سکای




بۆ ڕۆیشتن بـۆ هەریەک لەم چـوار بەشـە دەتـوانن لە سـێ گۆشـی سـەرەوە لای لۆگـۆی " Outlook" کرتەیەک بکەن و لە سەر هەر کامێکیان کە پێتان خۆشە سوودی لێوەربگرن کرتەیەک بکەن.




ئەمن دەچمە نێو خزمەتگوزاری Skydrive قەبارەی ئەم خزمەتگوزاریە ٧ گیگابایتە .




چۆن کار بکەین : بۆ نموونە لەسەرەتا بوخچەیێک بە نـاوی "منـداڵ کـانی هەڵـبجە"دروسـت دەکەم و وێنەیەک وپەرگەی ووردی تێبخەم، بۆ ئەم کارە چی بـکەم باشـە؟ لە سـەر مێنـۆی Create کـرتەیەک دەکەم و رستەی Folder هەڵدەبژێرم و بوخچەیەک بە ناوی "منداڵ کانی هەڵبجە"دروستدەکەم.




دەچمە ناو بوخچەی"منداڵەکانی هەڵبجە" وێنەیەکی لێ باردەکەم ! شێوەی کارەکە بەم جـۆرەیە، سـەرەتا لەسەربوخچەی دروستکراوە کرتەیێک دەکەم تا دەچمە ناوی پاشان لە مێنۆی سەرەوە لە سـەر Upload کرتەیەک دەکەم وە لە ناو هاردەکەم وێنەیەک هەڵدەبژێرم تاکو بە تەواوی باردەکرێتە ناو بوخچەکەم.




ئێستا دەخوازم پەرگەیەک لە پرۆگرامی وۆرد بخەمە ناو ئەم بوخچە یان پەرگەیەک لە پرۆگرامی پاوەرپۆینت( بۆ ئەوە لە هەرکوێ بم بتوانم بە ئاسانی دەستم پێیان بگات ).

لە مێنۆی Create لە سەر ڕستەی Word document کرتەیەک دەکەم پاشان ناوێک بۆ پەرگەی وۆردەکەم هەڵدەبژێرم بەناوەی"نووسراوەکانی هەڵبجە " وە بەهۆی دوگمەی Create کرتەیەک دەکەم




تا دەچمە نێو پرۆگرامی سەرهێڵی وۆرد بۆ نووسینی بابەتەکەم.کاتێک بابەتەکەم تەواو بوو دوگمەی پاشەکەوت Save لە قەراغی سەرەوە لای چەپ لێدەدەم.




کاتێک پاش پاشەکەوتکردنی پەرگەی وۆرد دەگەڕێنەوە بۆ Skydrive دەبینن لە سەر بوخچەی "منداڵەکانی هەڵەبجە " ژمارەی ٢ نووسراوە ئەمە ئەو پەرگانەیە کە لە ناو ئەو بوخچەیەدا بوونی هەیە.




کردارەکانی سەر بوخچەو پەرگەکـان : کاتێـک لە سـەر بـوخچە یـان پەرگە کـرتەیەک بـکەن لە مێنـۆی سەرەوە رستەکانی کردار دەردەکەون یان کاتێک کرتەی ڕاست بکەن.




Open : کردنەوەی بوخچە و نیشان دانی پەرگە.

Download: داگرتنی بوخچە یان پەرگە .

Sharing : هاوبەشیکردنی بوخچە یان پەرگە بە شێوازی ناردن بە ئیمەیل ، تۆرەکۆمەڵایەتیەکان ، یان شێوازی بەستەردان بە لینک .

Embed : نیشاندانی کۆد بۆ نێو وێبلاگ یان پەڕەکانی وێب یان مەکۆکان.

Rename: گۆڕانی نێوی بوخچە یان پەرگە.

Delete : سرینەوەی پەرگە یان بوخچە .

Move to : گواستنەوە بۆ جێگایەکی دیکە لە Skydrive.

Propertices : بۆ بینینی زانیاریەکانی بوخچە یان پەرگە، بۆ نموونە قەبارە شوێنی پاشکەوت، نێو ، هاوبەشبوون، کاتی زیاد بوون لە سەر بۆشایی هەوریهتد... .

پاش هەڵبژاردنی بوخچەی "منداڵانی هەڵەبجە" کرتەی ڕاستم کرد وە ڕستەی Sharingم هەڵبژارد پاشان بۆ هاورێیەکم لە ڕێگای ئیمەیل نارد :




ئێوە ئەتوانن بوخچە یان پەرگەکانتان لە رێگای تۆرەکۆمەڵایەتیەکانی فەیس بووک ،تویتەر،لینکدین یـان بە شێوازی لینکی راستەو خۆ بڵاو بکەنەوە.




کاتێک کرتە لە سەر ورستەیManageStorage لە لای چەپ دەکەی دەتوانی قەبارەی بەکاربردووی کراوەی نێو سکای درایڤەکەت ببینی و ئاگاداری بیت یـان تـا ١٠٠ گیـگ قەبارەکەی زۆر بکەیت کە ئەم بەشە بە پارەیە.




کرتە لە سەر ئەم دوکمەیە دەتبات بۆ کرینی قەبارەی زۆرتر بۆ بۆشایی هەوری سکایف درایڤەکەت

### دامەزراندنی IIS8 لە سەر ویندۆز :

یەکێک لە بەرنامە باشەکان بۆ بەرنامەنووسەران کە لەسەر ASP.NET کار دەکەن دامەزراندنی IIS (Internet Information Services)کە ویـندۆز ٨ نـوێترین وشـانی IIS هەیە کە ناسراوە بەناوی٨ IIS .

بوونی پرۆگرامی IIS لە ویندۆز خۆویستەی(اختیاری) و هـیچ ناچار نیـت کە دایمەزرێنیـت بـۆ ئەوەی کە لە سەرەتا مایکرۆسۆفت خۆی ناچالاکی کردووە.بـۆ دامەزرانـدن هاوکـات کلیلەکـانی Windows+ R لێبدەن تا خشتی RUN بکرێتەوە پاشان وشـەی appwiz.cpl بنووسـە و کلیلی Enter لێبدەن.




بەم نووسراوەی بەرنامەیProgram and Features لە Control Panel دەکرێتەوە لە قەراغی چەپ لە سەر ڕستەی "Turn Windows features on or off" کرتەیێک بکە .




پاشان بگەڕێ بەناوی Internet Information Services پاش دۆزینەوەی و هەڵبژێرە.




بەشێوازی بنەڕەتی ئەو پێداویستیانە کە بۆ دامەزراندنی ماڵپەڕێـک پێویسـتە دادەمەزرێـت.بەڵام ئەگەر ئێوە کامپۆنێنتێکی زۆرترتان دەوێت لە سەر هێمـای + لەقەراغـی **Internet Information Services** کرتەیەک بکەن و پاشان کامپۆنێنت هەڵبژێرن کە کارتان پێیدەبێت.



له سەر دوكمەی ok کرتەیەک بکەن تا پەنجەرەی خوارەوە نیشان بدرێت .






کاتێــک ئەم خزمەتگــوزاریە بە تەواوی دامەزرا وێبگەرەکەتــان بــکەنەوە وشــەی localhost بنووسن پاشان لۆگۆی IIS دەبینن مانای ئەم پەڕە ئەوەیە کە ISS بە سەرکەوتوویی دامەزرا.




سەرچاوەی بابەت :
http://www.howtogeek.com/112455

### کارکردن بە task manager (بەڕێوەبەری ئەرکەکانی ویندۆز ):

task manager یەکێک لە بەهێزترین بەشەکانی ویندۆزی ٨ ە کە بەسوود وەرگرتن لە تایبەتمەندیەکانی ڕەقەکالاکانمان بە شێوازی گرافیکی پیشان ئەدات.ڕۆژانە ئێوە چەندین جار سەردانی ئەم پەنجەرە دەکەن بەتایبەت کاتێک کە هەست دەکەن خێرایی کۆمپیوترەکەتان دابەزیوە، یان کامە بەرنامە بیرگەکەتانی بەخۆیەوە زۆرتر مەشغوول کردووە. ئێستا لە بارەی ئەم پەنجەرە شرۆڤەیەک دەکەین، چۆن پەنجەرەی task manager ئاوەڵا بکەم ؟ بە چەند شێواز:

١-لە ڕێگای تەختە کلیلەوە هاو کات ئەم کلیلانە لێبدە CTRL + ALT + DELETE پاشان task manager هەڵبژێرە .




٢- لە سەر شریتی ئەرک(taskbar)کرتەیەکی ڕاست بکەو **بەڕێوەبەری ئەرکەکان** هەڵبژێرە.




٣-بڕۆنە پەڕەی دەستپێک start screen بنووسن task manager پاشان لە ئاکامی گەڕانەکەدا، بەڕێوەبەری ئەرکەکان دەردەکەوێت و پاشان هەڵێبژێرن.



٤-کلیلی windows+R لێبدە تا پەنجەرەی Runت بۆ دەکرێتەوە پاشان لە نێو خشتەی گەڕان دا **taskmgr.exe** بنووسە




٥-لە ڕێگای هاوکات گرتنی تەختەکلیلەکانی**CTRL + SHIFT + ESC** بۆ ئاوەڵاکردنی پەنجەرە بەڕێوەبەری ئەرکی ویندۆز.

کاتێک توانیتان بەیەکێک لە ڕێگاکانی سەرەوە پەنجەرەی بەڕێوەبەری ئەرکی ویندۆز بکەنەوە، چوار بەش دەبینن، کە بریتین لە CPU | Memory | Disk | Network لەم بەشانە سوود وەرگرتنی ڕەقەکاڵا بە بەرنامەکانی دامەزراوە لە سەر ویندۆز دەردەکەوێت، بۆ نموونە بڕی چەند لە CPU بە بەرنامەیێک سەرقاڵە(گیراوە) !




یەکێک لە باشیەکان دیاریکردنی بەشەکانە کە پێمان دەڵێت هەر بەش چەندە بۆشایی بە خۆیەوە تەرخان کردووە .

بەشی Performance بەڕێوەبەری ئەرک :

لە بەشی Performance دەتوانن زانیاریەکی باش لە بارەی CPU وRamوDisk بەدەست بێنن، هەروەک لەم وێنەی خوارەوە دەبینین کە خێرایی cpuچەندە و چەندە خەریکی پروسێسە !




بەشی App History ئەو بەرنامانە کە لە پەڕەی مێترۆ یان پەڕەی دەستپێک چالاکن دەبینین.



بەشی Startup Task Manager ئەوبەرنامانە کە لە کاتی دەستپێکی ویندۆز چالاکن نیشان ئەدات .هەروەها لە ژێر خشتەی impact ئاستی کاریگەری بەرنامە بۆ سیستەم دەر دەخات کە کاریگەری لە خێرایی لاوازە (Low) یان بەهێزە (High).




بەشی Users لەم بەشە سەرچاوەی سیستەمەکەمان کە لە لایەن بەکارهێنەران داگیر دەبن نیشان ئەدات بۆ وێنە هەر بەکارهێنەر بە چ بەرنامە چەندە لە بۆشایی ڕێکخەرەکەی داگیر کردووە بۆ لابردنی لە سەر بەرنامەکەی کرتەی ڕاست دەکەین و End task لێدەدەین.




بەشی Details لە سەر ئەم خشتەیە تەواوی بەرنامەکان کە چالاکن و هەروەها جۆری بەکارهێنەری بەرنامەش نیشان دەدرێت.




بەشی Services لە سەرئەم خشتەیە ئەو خزمەتگوزاریانە کە لە ویندۆز ٧ لە ڕێگای controlpanelچالاک یا ناچالاک دەبوو نیشان دراوەن.




نمایشی ڕێکخەرەکان (See Logical Processors): ئەمڕۆ زۆرتری بەکارهێنەران لە چەندین ڕێکخەر(processor) لە سەر کۆمپیوتەرەکەیان سوود وەردەگرن . ئەمەش خۆی دەبێت بە هۆکارێک کە بەکارهێنەر کاتێک لە چەند پرۆگرام کەڵک وەردەگرێت هەر ڕێکخەرێکی

که به خۆیەوه سەرقاڵ بکات و خێرایی کۆمپیوتر زۆر دانەبەزێته خوارەوه .بەم ڕێگا ئێوه دەتوانن سەرقاڵی ناوەرۆکی هەر ڕێکخەر ببینن وه کرداری تایبەتی له سەر ئەنجام بدەن. بۆ ئەم مەبسته ئێوه دەتوانن له سەر خشتەی Performance (ئەرک بەجێهێنان) کرته بکەن و بەشی CPU هەڵبژێرن.له لای ڕاست کرتەی ڕاست بکەن وله بەشی Change graph to ڕستەی Logical processors هەڵبژێرن.Task Manager به شێوەی ئاسایی تەنها ڕێکخستنەکانی CPU نمایش دەکات بەڵام بەم فێڵه ئێوه دەتوانن له هەر ناوەرۆکێک له CPU به شێوازی جیا جیا ببینن.




**خێرایی نوێکردنەوەی زانیارییەکان Update Speed :**

به شێوازی بنەڕەت له Task Manager نوێکردنی زانیارییەکانی ئەم پەنجەرە هەر ٦٠ چرکه نیشان دەدرێت ونوێ دەبێتەوه بەڵام ئێوه دەتوانن زۆر به ئاسایی ئەم کاته کەم بکەنەوه یان زۆری بکەن . بچنه نێو خشتەی View پاشان Update Speed وه یەکێک له ژێر مێنۆکانی High (زۆر) , Normal (ئاسایی)، Low(کەم) هەڵبژێرن.



زۆرترین کات بۆ نوێکاری ئەم پەنجەرەیە (بەرێوەبەری ئەرکەکانی ویندۆز)٣٠ چرکەیە وە زۆرترین کات بۆ نوێکردنی ئەرکەکان ٤ خولەکە.

زانیاری ڕایەڵە : گەر کۆمپیوتەرەکەتان لە ناو ڕایەڵەی خۆماڵی یان ئینتەرنێت هەیە دەتوانن بۆ زانیاریەکانی لە سەر گرافی ئەو بەشە کرتەی ڕاست بکەن پاشان ڕستەی View network details هەڵبژێرن.




لێرە ئێوە دەتوانن زانیاری زۆر وەکوو ئەندازەی بایتی ناردراو و بایتی وەرگرتن هەروەها خێرایی ڕایەڵەکە و سوود وەرگرتن لە تۆڕەکەتان بەدەست بێنن وببینن.


Network Details

| Property | Ethernet |
|---|---|
| Network utilization | 0% |
| Link speed | 1 Gbps |
| State | Connected |
| Bytes sent throughput | 0% |
| Bytes received throughput | 0% |
| Bytes throughput | 0% |
| Bytes sent | 70,592 |
| Bytes received | 91,211 |
| Bytes | 161,803 |
| Bytes sent per interval | 0 |
| Bytes received per interval | 120 |
| Bytes per interval | 120 |
| Unicasts sent | 160 |
| Unicasts received | 139 |
| Unicasts | 299 |
| Unicasts sent per interval | 0 |
| Unicasts received per interval | 0 |
| Unicasts per interval | 0 |
| Nonunicasts sent | 254 |

نیشاندانی وەردەکاری Summary View لە سەر دێسکتۆپ :لە سەرخشتەیPerformance دەتوانن ڕستەی Summary View هەڵبژێرن .




لەم وێنەیەی لای خوارەوە دەبینن کە پەڕەی وەردەکاری بچکۆلە بووە. دەتوانن لە هەر کوێی بتانەوێت دێسکتۆپەکەتان بیگوێزنەوە و نیشانی بدەن.




هەروەها دەبینن کە مایکرۆسۆفت لەم بەشە بە باشی کاری کردووە و زۆر بە هێز خۆی نیشان داوە، ئەمە بەواتای ئەوەی ئێوە لە ڕەقەکالای کۆمپیوتەرەکانتان زۆر بە ئاسانی و بێ کێشە زانیاریتان دەبێت وە دەتوانن چاودێری بکەن.

## دامەزراندنی ویندۆزی ٨ لە ڕێگای فلاش میمۆری :

سەرەتا زۆر جار ڕێک دەکەوێت کە کۆمپیوتەرەکەمان درایڤی دی ڤی دی نیە یان خراپ دەبێت یان کاتی واهەیە ئەو دی ڤی دی یەی کە کڕیومانە پرۆگرامی ویندۆزەکەی بە باشی لە سەر رایت نەکراوە یان پێتان خۆشە دامەزراندنی ویندۆز لە باتی ٣٠ خولەک بە ١٥ خولەک ئەنجام بدەن. دامەزراندنی ویندۆز ٨ زۆر سادەو ساکارە بەڵام بەمەرجێک لە جێگای دی ڤی دی، لە فلاش میمۆری سوود وەربگرین بۆ ئەم مەبستەش :

١-پەرگەی iso ویندۆزی ٨ ، دادەگرین یان بە نەرمەواڵەکان ئیمەیجێک لە ویندۆز ٨ دەگرین

٢-نەرمەواڵەی Windows 7 USB/DVD Download Tool دابگرن لە ماڵپەڕەی فەرمی(http://wudt.codeplex.com). دەبینین کە جیاوازی لە نێوان ویندۆزی ٧ و٨ نیە.

٣--ئەم بەرنامەیە دامەزرێنن لە سەر کۆمپیوتەرەکەتان هەروەک لەم وێنەیەی لای خوارەوە دا دیارە، پەرگەی iso ویندۆز لە ڕێگای دوگمەی Browse هەڵبژێرن پاشان Next لێبدەن.




٤-ئێستا فلاش میمۆری(USB)ە کەتان لە کۆمپیوتەرەکەتان ببەستن باشتر وایە قەبارەی فلاشەکەتان ٤ گیگ بێت بەڵام واباشترە ئێوە قەبارەی ٨ یان ١٦ هەڵبژێرن لەم قۆناخە دا پێتان دەڵێت کە پاڵپشتی یان خۆد باک ئەپێک-Back Up - لە ویندۆز ٧ وەربگرن بەڵام پێویست نیە ئێوە کرتە لە سەر دوکمەی USB Device بکەن.



لەو مێنۆیەی کە دەکرێتەوە USB یان فلاشەکەتان هەڵبژێرن وە هەر کات کە ئامادە بوون لە سەر دۆگمەی Begin Copying کرتەیێک بکەن




لەم قۆناغە پرسیارێکتان لێدەکات بۆ سڕینەوەی فلاشەکەتان ئەگەر پەرگەیێکی لە سەرە، بیگوازنەوە تا دوور بێت لە سڕینەوە، پاشان سڕینەوە دەستبکەن بە دامەزراندن . کەمێک دەبێت چاوەڕوان بن تا پەرگەکان کۆپی بکرێتە ناو فلاشەکەتان .




پاش تەواو بوونی کۆپی پەیامێک دەردەکەوێت کە "پاڵپشتی" بە سەرکەوتوویی تەواو بوو "



دامەزراندن :

تا ئێستا فلاشەکەتان ئامادە کرد بۆ ئەوەی کە ویندۆزی لە سەر دابنێن و ئێستا چۆن ویندۆز دادەمەزرێنین .

١-ئەگەر لە ناو ویندۆزی ٧ دان فلاشەکەتان ببەستن لە کۆمپیوتەرەکەتان و بڕۆنە ناوی و پەرگەی setup.exe بدۆزنەوە وە کرتەیێکی لە سەر بکەن، پاشان پرۆسەی دامەزراندن دەستپێدەکات . بەڵام ئێوە دەتوانن بە جێگای دامەزراندنی ئێستا لە سەر دوکمەی (upgrade) کرتەیێک بکەن-سەردانی هەنگاوەکانی ژمارەی ٣ لە لاپەڕەی ١٠ بکەنەوە.

٢-ئەگەر لە سەر هاردەکەتان ویندۆز نیە دەتوانن فلاشەکەتان بدەن لە کۆمپیوتەرکەتان وە لە بە شی بایۆسی(BIOS) کۆمپیوترەکەتان – کە بە لێدان دوکمەی Delete یان F2 یان F12 لە سەرەتای دەسبەکارکردنی کۆمپیوتەرەکەتان دەچنە ناو پەڕەی بایۆس- یەکەمین ڕەقەواڵە بۆ بووتی سیستەمەکە USB یان Removable Flash Memory هەڵبژێرن وە ڕێکخستنەکەتان لە پەڕەی بایۆس پاشکەوت بکەن، بۆ ئاگاداریتان نیشان دانی ئەم پەڕەیە لە هەندێک کۆمپیوتەر جیاوازبێت، بەڵام دەتوانن لە دەفتەرچەی ڕێنمایی کۆمپیوترەکەتان سوود وەربگرن.




ئێستا ئێوە دەتوانن ویندۆز لە ڕێگای فلاشەوە دامەزرێنن هەر وەک درایڤی دی فی دی یەکەتان بەڵام خێرایی ئەم ڕێگایە زۆرترە.

سەرچاوەی بابەت :

http://www.makeuseof.com/tag/how-to-install-windows-8-from-a-usb-stick

## دامەزراندنی زمانی کوردی :

١-دەچنە نێو CONTROL PANEL وە لە سەر ئایکۆنی LANGUAGE کرتەیەک دەکەن.




٢-لە پەڕەی زمانەکان کرتەیەک لە سەر ڕەستەیAdd language بکەن




٣-لە بەشی پیتی C ، "کوردی ناوەڕاست" نیشانە بکەن وە لەسەر دوکمەی Add لە خوارەوەی پەڕە کرتەیەک بکەن:




لە بەشی دێستکتۆپ لە مێنۆی setting لەسەر وشەی keybordکرتەیەک بکەن و زمانی کـوردی هەڵبژێرن.




دەتوانن لە ماڵپەری کوردئایتیگرووپ(kurditgroup.org) لە سەرەوەی پەڕە بەشی داگرتن تەختەکلیل بۆ ویندۆز ٨ دابگرن و پاشان دای بمەزرێنن.




**دەستپێگەیشتن بە** Control panel :

١-بە یارمەتی کلیلەکانی تەختەکلیل لە هەر کوێ بە واتەیێک win+X لیستێک پیشان ئەدات کەدەتوانی Control Panelیشی تێدا ببینی.




٢-شریتی چارم بکەرەوە لە بەشیSettings لە سەرەوە Control panel دەبینیت.

٣-لە تەختەکلیل، کلیل win+R لێبدە وە لە خشتەی پەنجەرەی Run بنووسە Control panel .




٤-لە پەڕەی ستارت کلیلەکانیwin+Q لێبدە پاشان لەخشتەی گەڕان بنووسەControl panel




دەتوانی لە وێنەی سەرەوە لە لای ڕاست کرتەی ڕاست بکەی و ئایکۆنی Control panel پین بکەی بە پەڕەی ستارت کە هەمیشە لە بەردەست بێت.

شێوازی دووهەم لە پەنجەرەکانی ویندۆز :

١-لە ویندۆزی ٧ لە وێبگەڕی ویندۆز کرتەیەک لە سەر کۆمپیوتەر دەکەن لە توولْ ئامراز Control panel دەبینن.




بەڵام لە ویندۆز٨ ڕستەی Control panel هاتووەتە ناو نەواری ریبۆن(شێوازی مێنۆی ریبۆن یەکەم جار لە لایەن مایکرۆسۆفت لە ئۆفیسی ٢٠١٠ نیشان درا)



قەدبڕەکان (shortcuts)ی ویندۆز ٨ :

قەدبڕەکان فەرمانێکن کە لە سەر تەختەکلیل لە لایەن بەکارهێنەر دەدەرێت، نەرمەواڵە جێبەجێی دەکات. کاتی وا هەیە کە مشک لە کار دەکەوێت یان پێتان خۆشە خێراتر ئیشێک بە کۆمپیوتەرەکەتان ئەنجام بدەن. نموونەیەک لە قەدبڕەکان کە زۆر کارمان پێیەتی کلیلەکان ctrl+c ,ctrl+x ctrl+v, ctrl+zە کە لە نێو پەنجەرەکان ونەرمەکالاکان کاری پێدەکەین.

بەڵام لێرەدا ژمارەیەک لە قەدبڕەکانی ویندۆز ٨ فێر دەبین :

| | |
|---|---|
| گواستنەوە لە نێوان پەڕەی دەستپێک (start) و ڕوومێز (desktop) و دوایین داوانامە (application) | ⊞ |
| چالاک کردنی شریتی ئەفسوونەکان (چارمەکان) | ⊞ + C |
| دەستپێکەیشتن بە تووڵ ئامرازی پەڕەی ستارت | ⊞ +Tab |
| دەستپێکەیشتن بە ڕێکخستنەکانی چارم | ⊞ + I |
| دەستپێکەیشتن بە دووگمەی هاوبەشکردنی چارمەکان | ⊞ + H |
| دەستپێکەیشتن بە ئامرازەکانی چارم | ⊞ + K |
| دەستپێکەیشتن بە خشتی گەڕان لە ئەپلیکەیشنەکان | ⊞ + Q |
| دەشتپێکەیشتن بە خشتی گەڕان لە پەڕگەکان | ⊞ + F |
| دەستپێکەیشتن بەڕێکخستنەکانی پەڕەی گەڕان | ⊞ + W |
| دەستپێکەیشتن بە دووهەمین شریتی گەڕان | ⊞ + P |
| کاتێک لە پەڕەی ستارتن شریتی ئەپەکان دێنێتە سەرەوە | ⊞ + Z |
| دەستپێکەیشتن بە مێنۆکانی تولْ ئامرازی ویندۆز | ⊞ + X |
| قوفڵ کردنی پەڕەی ستارت | ⊞ + O |
| جولەی پەڕەی ستارت بۆ لایەی ڕاست | ⊞ + . |
| جولەی پەڕەی ستارت بۆ لایەی چەپ | ⊞ +Shift+. |
| نیشان دانی تەواوی هەڵەکان و هۆشیاریەکانی چالاک | ⊞ + V |
| نیشاندانی تەواوی هەڵەکان و هۆشیاریەکان بە پێچەوانە | ⊞ + Shift+V |

| | |
|---|---|
| گرتنی وێنە لە شاشەکەت وپاشکەوتی لە بوخچەیێک بە ناوی SCREEN SHOT لە بوخچەی وێنەکانت | +PrtScr |
| ئاوەڵاکردنی پەڕەی------ | + Enter |
| ئاوەڵاکردنی پەنجەرەی کۆمپیوتەر | + E |
| ئاوەڵاکردنی پەنجەرەی Run | + R |
| ئاوەڵاکردنی پەنجەرەی کۆمپیوتەری چالاک | +Ctrl+F |
| ئاوەڵاکردنی پەڕەیەکی سیستەم | +Paus+Break |
| چەسپاندنی پرۆگرام بە شریتی ئەرکەکان بە ریزبەندی ژمارەکان١...١٠ | +1...10 |
| گەڕان لە پرۆگرامەکانی سەر شریتی ئەرک | + T |
| بچکۆلە کردنی تەواوی پەنجەرەکان | + M |
| گەڕاندنەوەی پەنجەرە بچکۆلەکان بە شێوازی پێشتر | +Shift+M |
| نیشاندان و شاردنەوەی دێسکتۆپ (بچکۆلەکردن/گەڕاندنەوەی پەنجەرەکان) | + D |
| قوفڵ کردنی کۆمپیوتەر | + L |
| گەورەکردنی ئەندازەی پەنجەرەکان | + Up Arrow |
| گەڕاندنەوە / بچکۆلەکردنی پەنجەرەی چالاک | +Down Arrow |
| بەگشتی پەنجەرەکان جگە لە پەنجەرەی چالاک بچکۆلە دەکات | +Home |
| کاشیەکانی ویندۆز دەخاتە بۆشایی چەپ | +Left Arrow |
| کاشیەکانی ویندۆز دەخاتە بۆشایی ڕاست | +Right Arrow |
| ئاوەڵاکردنی پەنجەرەی یارمەتی ویشتیوانی | + F1 |
| لە پەڕەی ستارت پێچۆکە جوولە پێدەکات(بۆ بەرەوە) | Page Up |
| لە پەڕەی ستارت پێچۆکە جوولە پێدەکات(بۆ دواوە) | Page Down |
| داخستنی ئەفسونەکان(چارمەکان) | Esc |

| | |
|---|---|
| جووله له نێوان پەڕەی ستارت ودوایین ئەپلیکەیشنی چالاک | Esc+Ctrl |
| چالاککردنی گەورەنەویی پەڕەی ستارت | Esc+mouse scroll weel |
| ئاشکراکردنی شریتی منێۆکان | Alt |
| پێش نمایشی چوارگووشه له ویندۆز ئیکسپلۆرەر | Alt + P |
| هەڵبژاردنی توولی(ئامراز)ی ناونیشان | Alt + D |
| هەڵبژاردن له نێو پەنجەره ئاوەڵاکان | Alt + Tab |
| داخستنی پەنجەرەکانی چالاک، کردنەوەی پەنجەرەکانی ناچالاکی دێسکتۆپ | Alt + F |
| هەڵبژاردن له نێۆ پەنجەره ئاوەڵاکان بۆ دواوه | Alt +Shift+Tab |
| دیتنی قەدبڕەکانی پەنجەرەی چالاک | Alt +Spacebar |
| گەڕان له ناو پرۆگرامەکانی ئاوەڵا به ڕێزبەندی کارکردنیان | Alt + Esc |
| دیتنی زانیاریەکانی پەرگه یان بوخچەی هەڵبژارده | Alt +Enter |
| نمایشی ناوەرۆکی cd/dvd بێجگه له شێوازی خۆکار | Shift+ insert |
| سڕینەوه به تەواوی ناچێته سەتڵی زبڵ | Shift+ Delete |
| گەڕانەوه بۆ دواوه له نێو ئایتێمەکانی پەنجەره | Shift+F6 |
| دەستپێکەیشتن به مێنۆی ئایتێمەکان بۆ هەڵبژاردن | Shift + F10 |
| هەڵبژاردنی کۆی پەرگەکان | Shift +click |
| هەڵبژاردنی کۆی پەڕگەکان | Ctrl + A |
| ڕوونووس کردنی پەڕگەکان | Ctrl + C |
| بڕینی پەڕگەکان | Ctrl + X |
| لکاندنی پەڕگەکان | Ctrl + V |
| پووچەڵکردنی کردارێک یان فەرمانێک | Ctrl + Z |

| | |
|---|---|
| سڕینەوەی پەرگەی هەڵبژاردراو | Ctrl + D |
| دووپات کردنی کردارێک یان فەرمانێک | Ctrl + Y |
| کردنەوەی پەنجەرەیەکی نوێ لە ویندۆز ئیکسپلۆرەر | Ctrl + N |
| داخستنی پەنجەرەیەک لە ویندۆز ئیکسپلۆرەر | Ctrl + W |
| هەڵبژاردنی خانەی گەڕان لە گۆشەی سەرەوە قەراغی ڕاست | Ctrl + E |
| دروستکردنی پەنجەرەیەکی نوێ | Ctrl + Shift+N |
| نیشاندانی پەنجەرەی یارمەتی | F1 |
| نێونانی دووبارەی پەرگە | F2 |
| دەستپێکردن بە گەڕان | F3 |
| نیشاندانی لیستی تووڵ ئامرازی ناونیشان | F4 |
| نوێکردنەوی سیستەم | F5 |
| گەڕان لە پەنجەرەکان | F6 |
| نیشاندانی مێژووی فەرمانەکانی دۆس وە بە پێچەوانە | F7 |
| نیشاندانی تووڵ ئامرازی مێنۆ | F10 |
| نمایشی تەواوی پەڕە | F11 |
| گەڕانی بەرەوەی پەنجەرەکان | Tab |
| جوولە بەرەو سەرەوەی پەنجەرەی چالاک | Home |
| جوولە بەرەو خوارەوەی پەنجەرەی چالاک | End |
| سڕینەوەی پەرگەی هەڵبژاردراوە | Delete |
| داخستنی پەنجەرەی کراوە | Esc |

له كۆتايی :

خوێنەری خۆشەویست ، هیوادارم تا ڕادەییێکی باش لە گەڵ ویندۆز ٨ ئاشنایەتیتان وەرگرتبێ. ئەگەر کێشـەیەک یان هەڵەیەک لەم پەڕتووکەدا هەبـوو دەتـوانن لە وێـبلاگەکەم ئاگـادارم بـکەنەوە. بەوپەڕی خۆشـحاڵیەوە ڕخـنەو پێشنیارەکانتان بە هەند وەردەگرم. هەوڵ ئەدەم لە کاتی پشوو دانم بـابەتی فێرکـاریی زۆرتـر لە وێـبلاگەکەم بـۆ ئێوەی خۆشەویست دابنێم هەروەها لە بارەی ویندۆز ٨ی مایکرۆسۆفت زانیاری زۆرتر بنووسمەوە.

لەگەڵ ڕێزو خۆشەویستی بێ پایانم دا
قەزوان

www.Qezwan.blogspot.com

Qezwan@gmail.com

سەر چاوەکان :

- فەرهەنگی کراوەی کورد ئایتیگرووپ http://dictio.kurditgroup.org
- فەرهەنگی ئایتی زانستپەروەرانی کورد http://zkurd.org/?Besh=Ferheng
- کتێبی فەرهەنگی تەکنۆلۆژی زانیاری زانستپەروەرانی کورد
- وتارەکانی ماڵپەڕی howtogeek http://www.howtogeek.com
- ماڵپەڕی ئینگلیزی about http://www.about.com
- ماڵپەڕی ئینگلیزی buildeasypc http://www.buildeasypc.com
- ماڵپەڕی ئینگلیزیhongkiat http://www.hongkiat.com/blog
- ماڵپەڕی makeuseof http://www.makeuseof.com
- ماڵپەڕی فەرمی مایکرۆسۆفت http://windows.microsoft.com
- ماڵپەڕیئینگلیزی bleepingcomputer http://www.bleepingcomputer.com
- ماڵپەڕی ئینگلیزی eightforums http://www.eightforums.com